# مرۆڤێکی تر



د . موحسین ئەحمەد عومەر



د. موحسین ئەحمەد عومەر

# مرۆڤێکی تر



چاپی یەکەم

٢٠١١

لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبی نما

زنجیرەی(١١٤)

سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی چاپی کتێب

ئیسماعیل کوردە، ڕێبین ڕەسوڵ

ناوی کتێب: مرۆڤێکی تر

بابەت: وتارو لێکۆڵنەوە

نوسین: کۆمەڵێك نوسەر

وەرگێڕانی: د. موحسین ئەحمەد عومەر

پیتچنین: وەرگێڕ

بەرگ: سەرکەوت وەلی

دیزاینی : نما

چاپی یەکەم: هەولێر/ کوردستان

تیراژ: ٥٠٠

نرخ: ٢٥٠٠ دینار

چاپخانە: شەهاب



لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی "٥٤٥"ی ٢٠١١٠ی پێدراوە.

# سیمۆن دو بۆڤوار

... له كۆتایی حه‌فتاكان و سه‌ره‌تای هه‌شتاكان، تازه ئه‌ده‌بیات و فه‌لسه‌فه‌ی وجودی سه‌داو كاریگه‌ری گه‌یشتبووه كوردستان، به شه‌وق و سووتانێكی پڕ له كه‌ف و كوڵه‌وه به دوای به‌رهه‌مه‌كان و ئایدیاكانی سارتر Jean Paul Sartre و سیمۆن دو بۆڤوار S. De Beauvoir و ئه‌لبێر كامو Albert Camusو هایدگه‌ر Haidger و ئه‌وانیتر ده‌گه‌ڕاین، هیچ شتێك تێری نه‌ده‌كردین، له هه‌مان كات باشیش لەم فه‌لسه‌فه نوێیه نه‌ده‌گه‌یشتین، به‌ڵام هه‌ر ته‌نیا به ده‌سته‌وه گرتنی كتێبێكی ئه‌مانه هه‌موو شتێك بوو. سارتر و سیمۆن و كامو، بۆ ئێمه ره‌مزی یاخی بوون و خه‌بات بوو به‌سه‌ر داب و نه‌ریته كۆنه‌كان و هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه له ڕژێم و تیرۆر و زیندانی كردن، ئومێدێكی راپه‌ڕینی ژنان و هوشیاربوونه‌وه‌یان و جوان كردنی په‌یوه‌ندییه‌كانی نێوان ژنان و پیاوان ب بوو.

ئه‌وسا، رژێمی فاشیستی به‌عس، هه‌ر شتێك بۆنی ئازادی و بیركردنه‌وه‌ی ئازادی لێ بهاتایه، هه‌ر شتێك بۆنی ئه‌و هه‌وا تازه‌ی له رۆژئاواوه ده‌هات لێ بهاتایه، قه‌ده‌غه‌ی ده‌كرد و سه‌ره‌نجام ته‌نیا بیر و هزری چروك و بێ مانا له روانگه‌ی ئه‌وان باوی هه‌بوو. ئه‌و كه‌سانه‌ی بەم هه‌وا تازه‌یه خۆیان په‌روه‌رده ده‌كرد، نیشانه‌ی پرسیار و راونان و بگره زیندانی و تیرۆر كردنی له دوا بوو. ئه‌م

فەلسەفە نوێیەش لەگەڵ خەباتی کوردان، خەباتی پێشمەرگە و شاخ تێکی دەکردەوە، پێشمەرگە و سارتر و سیمۆن و کامو وێردی سەرزاری هەموو لاو و خورتێکی کورد بوو. سەرەڕای ئەوەی زۆر بە زەحمەت دەمانتوانی وشەی (ئێگزیستانسیالیزم = بوونگەرایی = فەلسەفەی بوون) گۆ بکەین، بەلاّم دیسان لە لای ئەوانیتر، واتە لە بەرامبەر ئەوانیتر هەر تەنیا گۆکردنی هێز و قورسایییەکی فیکری و کۆنترۆلکردنی شتەکانی بە ئێمە دەبەخشی، ئەمەش وەك دەستەلاتێکی مەعریفی ئالۆز بوو، بە لاف و گەزافەوە خۆمان پێ بادەدا، ئەوانیش تەقەی سەریان دەهات.

ئەوسا رستەیەکی سارتر هەبوو زۆر دوبارە و سێ بارەمان دەکردەوە کە دەیگوت : " وجودییەت فەلسەفەی هەلّوێستی ئازایانەیە"، ئەم رستەیە هەموو ئایدیا و هەلّوێستی ئێمەی کوردی روون دەکردەوە کە لە ناو هەژارییەکی رۆشنبیری و بێ کتێب و گۆڤار و رۆژمان بەسەر دەکردەوە، پەنامان بۆ کتێبی عەرەبی دەزگاکانی لوبنان دەبرد کە ئازایانە کتێبەکانی ئەم نووسەرە گەورانەیان چاپ دەکرد. بە بیرم دێتەوە بە شەوق و چەشەوە کتێبی (سێکسی دووەم)ی سیمۆن دو بۆڤوار و کتێبی (بوون و نەبوونی)ی سارترم خوێندەوە، لەم سەری کتێبەکان بۆ ئەو سەریان چووم هیچی لێ تێنەدەگەیشتم، بەلاّم لە خوێندنەوەش نەدەوەستاین و درێژەمان پێدەدا، ئەو ئێوارەی، زۆر لە ئێوارەکان، کە کتێبی ئەوها گەورە و زەبەلاحم وەك ئەم دوانەی سەرەوە، هی سارتر و دو بۆڤوار دەبردەوە ماڵ، باوکم لەگەڵ بینینی کتێبەکان لە دەستم دەترساو دەهات سەیری بەرگەکەی دەکرد، دەیگوت : باشە کورِم من تێناگەم باسی چی دەکات تۆ چۆن تێدەگەی ؟! ئەمە خۆی بەشێك بوو لە یاخی بوونەکە، پاشان کتێبی (هێزی شتەکان)ی سیمۆن دو بۆڤوارم خوێندەوە، ئەمەیان چونکە شێوەیەکی سادەتری هەبوو لە چاو (سێکسی دووەم) کە وەك ئەنجامێکی ئەو تەوژمە نوێیەی لیبرالیزمی نوێ و سۆسیالیزم و گۆڕانە کۆمەلاّیەتیە گەورەکانی رۆژئاوا و شۆڕشی ٦٨ سەیری دەکرێ، دەمێك بوو لە رۆژئاوا بوو بووە قیبلەی خەباتی ژنان و لاوان، سەرچاوەیەکی مەزنی یەکسانی نێوان ژنان و پیاوان بوو.

ئەوسا زۆر بە شەوقەوە حەزمان دەکرد ئەو کتێبە و کتێبەکانی سارتر و کامو و هێربێرت مارکوێز و هایدگەر بە کوردی هەبێ و کوڕان و کچانی ئێمەش بیانخوێننەوە، دواتر کە خۆمان لە فەرەنسا و پاریس دۆزییەوە، دوای فێربوونی فرەنسی، تێگەیشتم، وەرگێڕانی ئەم کتێبانە پێویستی بە فرەنسی زان و کوردی زانێکی باش هەیە. پاشان شتێکی دیکەی زۆر گرینگترم هەست پێکرد، کە ئێمەی کورد، لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە پیسەی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان پەیڕەویان دەکرد، ئێمەی کورد لە چ هەژارییەکی ماددی مەعریفی و لە ناو چ قەتیسبوونێکی کۆمەڵایەتی و شارستانی دەژین، بێ ناسنامەیی و بێ دەوڵەتی بۆ میللەتێکی گەورەی وەك کورد لە کۆیلەیی و عەبدایەتی خراپترە. چونکە زۆر خورت و لاو و پڕ لە بیرکردنەوەی هەستیار و پڕ لە هەڵچوونی خێراو کەف و کوڵ بووین، دەمانگوت یان ئەوەتە هەموومان بەیەکەوە بمرین یانیش وەك میللەتانی ئازاد بژین. بەڵام ئێمە، تازە گەیشتبووینە فرەنسا و بەرەو قۆناغێکی دیکەی ژیان و خەبات دەچووین، بەڵام ئێستاش ئەم کێشەیە هەر درێژەی هەیە، بۆیە من هەواداری ئەو ئایدیایەم، لەم حکومەتە تازەی خۆمان، بۆ پاراستنی و بۆ گۆڕانی شارستانی و بیناکردنی مرۆڤی کورد، مرۆڤێکی دیکە، بە ڕاستی نابێ لە هیچ بترسین، ئەوەی میللەتێکی وەك فرەنس و ئەڵمان و ئیتالی هەیانە، دەبێ ئێمەش هەمان بێ، ناسنامە و ولاتێك، پاسپۆرت و کتێبخانە و ژیانێکی سەرشار لە دەوڵەمەندی ماددی و مەعریفی...هتد.

ئەوەی لە خوێندنەوەی یەکەمی (سێکسی دووەم) ی چاپی عەرەبی بە بیرم مابێ و لەسەردەمی هەرزەکاری لە ناو ئێمە زۆر گرینگی پێ دەدرا، ئەو بیرە بوو کە لە ناو کۆمەڵ و خێزان: کوڕ و کچ تا سەردەمی بالغ بوون وەك یەك گەورە دەبن، کچیش وەك کوڕ هەمان بزێوی و چالاکی هەیە، بەڵام کە دەگەنە شانزە و حەڤدە ساڵی، کۆمەڵ و خێزان لێکیان جیادەکەنەوە و هەر یەکەیان بە لایەکدا و بە پەروەردەیەك گەورە دەکەن، هەر لەو سەردەمەوە، وشەکانی دایك و باوك و برا دەگۆڕێن، وشەی بەکارهاتوو بۆ کوڕ، وشەی بەکارهاتوو بۆ کچ، ئیتر لێرەوە سەردەمی قەدەغە و بڤە و ترساندن دەست پێدەکا، کچەکان راستەوخۆ دووچاری

خۆخواردنەوە و چوونەوە ناوخۆ و خەمۆکی و ترس و لەرز دەبن، ترسی باوك، هی کۆمەڵ، هی پەیوەندی...هتد، راستەوخۆ لێرەوە ئەو مرۆڤە بزێوە، ئەو مرۆڤە زیندووە لە ناو کچەکان دەکوژن، پیاو شێوەی دیوەزمە و پۆلیس و درندە وەردەگرێ. پیاویش، بە تایبەتی لە کۆمەڵی ئێمە، ژن و کچەکان وەك سێکس و ئەندامی سێکسی دەبینن، لەمە زیاتر وەك شتێکی دیکە نایبینن، هەر ئەمەشە، گشت پەیوەندییەکان بەرەو خوار و خێچی و لارێدا دەبا، سەرەنجام رووداوی تراژێدی و توندی و تیژی لێ دەکەوێتەوە، ژن خۆی دەسووتێنێ، کچ خۆی دەسووتێنێ، خۆی دەکوژێ، هەڵبەت ئەمەش لە بنچینەدا لە درۆیەکی گەورە زیاتر نیە، چونکە ئەوەی ئەم کارانە دەکا هەر پیاو و دەستەلاتی نێرە، دەستەلاتی نێر ژن دەسووتێنێ، کچ دەسووتێنێ، ژن دەکوژێ، کچان دەکوژێ...هتد.

دواتر کە "سێکسی دووەم"م بە فرەنسی خوێندەوە، بێگومان جارێکی دیکە و بە هوشیارییەکی دیکە، تێگەیشتم ئەم بیرەی سەرەوە، یەکێ لە هەرە گرینگترین ئایدیاکان و چارەسەرکردنی ئەم کتێبەیە، هەڵبەت لە پاڵ لێکۆڵینەوەیەکی خەست و پڕ لە مەعریفە و ئازایەتی.

کتێبی (سێکسی دووەم)ی سیمۆن دو بۆڤوار، سەرچاوەیکی مەزنی شارستانیە، کۆمەڵی ئێمە پێویستی پێی هەیە، پێویستە ژنانی کورد بیکەنە ئینجیلی خۆیان.

## قەپێلك و هەناسە ...!!؟؟

... باوكم هەردەم دەیگوت مرۆڤ لە دوو شت پێكهاتووە، قەپێلك و هەناسە. من ئەوسا هەرزەكار بووم، زۆر لەم دوو شتە نەدەگەیشتم، زۆرم لە ناو سەر دەهێناو دەبرد بەلاّم بێهوودە بوو. زۆرجار لابەلا جورنەتم دەكرد و دەمپرسی : ئەریٰ ئێوە مەبەستتان لە "قەپێلك و هەناسە" چیە؟! پرسیارەكانم هەردەم لە ناوەختدا دەكرد، بۆیە قەت وەلاّمی دروستم وەرنەدەگرت، پشتگویٰ دەخران، ئەمەش شتێكی سروشتی بوو، چونكە پرسیاری ناوەخت وەلاّمی ناوەخت وەردەگریٰ. هەموو ئەمەش لەبەر ئەوە بوو من جورئەتم نەدەكرد لە كاتی خۆی بپرسم ئەریٰ مەبەستتان لە قەپێلك و هەناسە چیە ؟!

ڕاستیەكەی تا سەردەمانێكی زۆر درەنگ ئەم پرسیارانە بەردەوام لە مێشكم دەخولانەوە، ئێستاش ئەو قەپێلك و هەناسەیە، هەمان ئالۆزی و تەم و مژی خۆی هەیە و تا ئێستا ساغ نەبۆتەوە چیە.

دوای تێبینی و بیركردنەوەیەكی زۆر، دەتوانم بڵێم ئەم سەرنجە (پرسیارە) بریتییە لە ڕوانینێكی سادە و ساكاری ڕۆژهەلاّتیانە (زیاتریش موسڵمانانە) بۆ مرۆڤ كە پێكهاتووە لە قەپێلك و هەناسە، واتە بە زمانی ئەمڕۆ جەستە و دەروون، لەش و گیان، كە بە هیچ جۆرێك لێكدانەوە و قوڵبوونەوەیەكی وردی لە پاڵ نیە بۆ كێشەی مرۆڤ خۆی، بۆ دەبیٰ مرۆڤی ڕۆژهەلاّتی بەم شێوەیە باس لە مرۆڤ بكا وەك دوو شتی یەكانگیری سادە و ساكار كە پێی دەگوتریٰ : قەپێلك و هەناسە، لە كاتێكدا هەموو فەلسەفەی ڕۆژئاوا بگەڕێی ڕوانینێكی لەم جۆرە نادۆزیتەوە. نەخێر مرۆڤ ئەوها نیە، نە قەپێلكە نە هەناسە، بەڵكو مرۆڤ بوونێكە

سەربەخۆ، بوونێکە لە ناو زەمان و شوێن دەژیێ، ژیانی سەربەخۆی نیە لەمانە، بەلاّم بە ئەقلّ و بیرکردنەوە خۆی دابڕاندووە لە زەمان و شوێن، لەسەردوەی ئەم دوو شتە دەژیێ، ئەوە مرۆڤە دەتوانێ هەست بە زەمان بکا و لە ناو زەمان بژیێ، ئەوە مرۆڤە هەست بە شوێن دەکا و لە ناو شوێن دەژیێ و دەتوانێ دەستکاری بکا نەك بە پێچەوانەوە، ئەسلەن مرۆڤ خۆی بەشێکە لە زەمان و شوێن، بەلاّم مرۆڤ ئاقلّمەندە و زەمان و شوێن دوو شتی بێ ئەقلّن، بێ بیرکردنەوەن، بۆیە کە تەعبیر لە خۆیان دەکەن تەنیا بە لافاو و بوومەلەرزە ئەم کارە دەکەن، نەك بە ئەقلّ و لۆژیك. مرۆڤ بەرامبەر بەم کردانە هیچی پێ ناکرێ چونکە ئەمانە کردەیەکن هیچ ئەقلّێکی بیرکەرەوەیان لە پشت نیە، زیاتر وەك تووڕەبوونێکی سروشتی دێنە بەرچاو نەك بە پێچەوانەوە. هەرچی مرۆڤە بیردەکاتەوە، تێبینی دەکا، بۆیە شتێکی بێ مانایە بگوترێ مرۆڤ جگە لە قەپێلك و هەناسە زیاتر نیە.

گوتم ئەم پرسیارە لە ڕوانینێکی تیۆری سادە و ساکاری ڕۆژهەلاّتیانە زیاتر نیە کە بە هیچ جۆرێك لێکدانەوە و وردبوونەوەی فیکری قوولّی لە پشت نیە، ئەمەش دیاردەیەکی سەرەنجڕاکێشە : بۆ مرۆڤی ڕۆژهەلاّتی تەنیا پرسیار دەکا ؟ هەلّبەت پرسیاری گرینگ دەکا، بەلاّم بیرکردنەوە و وردبوونەوەی قوولّی بۆ پرسیارەکەی خۆی نیە، لە کاتێکدا دەزانین گشت تیۆرە فەلسەفی و دەروونیەکان، ئەوانەی پێنج سەد سالّە ڕۆژئاواییەکان کاری لەسەر دەکەن و لێی وردبوونەتەوە و دەیان قوتابخانەو ڕێبازی فەلسەفی و دەروونییان لەسەر دارشتووە، هەمووی لە چوارچێوەی ئەم پرسیارە و پەیوەندی نێوان ئەم دوو شتە دەگێرسێتەوە : مرۆڤ بریتیە لە قەپێلك و هەناسە. بەلاّم لە ناو ئەم هەموو نووسینەی ئەمان ڕستەیەکی لەم جۆرە نادۆزرێتەوە.

لەمەوە تێگەیشتم، هەلّبەت دوای ئەوەی چل سالّ بەسەر ئەم پرسیارە تێپەڕیووە، هێشتا مرۆڤی ڕۆژهەلاّتی پرسیار دەکا بەلاّم خۆی بە وەلاّمدانەوە خەریك ناکا، پرسیار کردن گرینگە بەلاّم وەلاّمدانەوەی گرینگتر، پرسیار کردن سەرەتای ناسینی هەموو شتێکە، هی مرۆڤ، هی جیهان، بەلاّم وەلاّمدانەوە

نیشتەجێ بوونە لە ناو ئەم جیهانە و ئەم مرۆڤە. لێرەوە تێگەیشتم بۆچی فەلسەفە لە ڕۆژهەلاتدا نیە، چونکە پرسیار هەیە و وەلام نیە، بیرکردنەوە نیە، هەلچوون هەیە، خەیاڵ نیە،...هتد.

پاشان تێگەیشتم پرسیارکردنی لەم جۆرە مەبەستێکی زیاتر ئایینی لە پاڵە، واتە لە ڕوانگەیەکی ئایینی دوور لە هەموو زەمینەیەکی فیکری فەلسەفی کراوە، ئەم پرسیارە زیاتر ڕواڵەتێکی عاتیفی بەسەردا زاڵە، چونکە پرەنسیپەکانی ئایین لەسەر عاتیفە و ئەخلاق بەندە، هەلبەت دوور لەم تایبەتمەندییە دەشێ لێکدانەوەیەکی فیکری فەلسەفی بۆ بکرێ. ئەم ڕوانینە ئایینیە زیاتر بۆ بێ نرخکردنی مرۆڤ گوتراوە، هەلبەت لە بەرامبەر بوونێکی تری خەیالی، ئەو بوونەی لە ئاییندا هەردەم وەك ئەرکێك دەبێ مرۆڤ بە دوایدا وێلبێ و خەباتی بۆ بکا. چونکە لە ئاییندا دەگوترێ هەناسە (روح) بەرزدەبێتەوە (قەپێلك) یان جەستە دەمێنێتەوە، دەبێتە خۆراکی مار و مێروو.

بە پێچەوانەی ئەم ڕوانینە، مرۆڤ ئەگەر قەپێلك و هەناسەش بێ نرخێکی ئەوتۆی نیە. هیچ کێشەیەکی مرۆڤ چارەسەر ناکا، چونکە مرۆڤ کە عاشق بێ یان بەرامبەر بە جوانیەکی لە ڕادەبەدەر بێ، یان هۆکاری داهێنانێکی مەزن بێ، خۆی لە بیردەکاو دە چێتە سەرەوەی ئەم دەستەواژەیە کە دەڵێ : مرۆڤ جگە لە قەپێلك و هەناسە شتێکی تر نیە.

پاشان لە سەرەنجدانی ئەم پرسیارە، وەلامێکی تریشمان دەست دەکەوێ، ئەویش ترسە. ئەم ترسەش تەنیا لە لای مرۆڤی ڕۆژهەلاتی هەیە، چونکە بوون کە بە ڕواڵەتێکی پڕ لە پەنهانی شاراوەیی و ئالۆزی دێتە بەرچاو، ئەو سادە و ساکاری دەکاتەوە و دەیهێنێتە ئاست پرسیارێکی بێ ناوەڕۆك، ئەمەش : مرۆڤ جگە لە قەپێلك و هەناسە شتێکی تر نیە. ڕووچوون بە ناو بیرکردنەوە و قوولبوونەوە لەم پرسیارە خۆی لە خۆیدا ترسێکی هەلگرتووە، مرۆڤی ڕۆژهەلاتی بۆیە ئەم کارە ناکا، چونکە یەکەم : ئەرکێکی ئایینی ڕێی پێ نادا، دووەم : بە شتێکی زیادی دەزانێ، چونکە ڕووبەڕووبوونەوە ترسێکی هەلگرتووە، ترس لە خۆ، ترس لە بوون، ترس لە زانین، ترس لە گەیشتن بە یەقین، ئەسلەن مرۆڤی

ڕۆژهەڵاتی لە بیرکردنەوەش دەترسێ، چونکە بیرکردنەوە ڕووبەڕووی پرسیار و وەڵامە قورسەکانی دەکاتەوە، ...هتد.

هەر لەبەر ئەمە دەبینین هەموو داهێنانێکی (ئەگەر شتێك هەبێ بە ناوی داهێنان لە لای ئەو) لە کاری ئەدەبی و هونەری و زانستییەوە بگرە تا دروستکردنی بالاخانەیەك، فۆرم و هەڵکەوت و بیرکردنەوەیەکی سادە و ساکار و چرووك و بێ مانا لەسەری زاڵە. ئەسڵەن بیرنەکردنەوە و نەگەڕان بە دوای پوختەیی و جوانی و داهێنان سیفەتی سەرەکی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتییە، مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی ئەوەندەی بەرەو چەشە و لەززەتەکانی جەستە (قەپێلك) دەچێ ئەوەندە بەرەو چەشە و لەززەتەکانی بیرکردنەوە (هەناسە) و داهێنان ناچێ، بۆیە کە وتارە فەلسەفییەکان، ئەدەبییەکان، چیرۆکەکان، شیعرەکان، بالاخانەکان، پەیکەرەکان، جادە و شەقامەکان دەبینی دووچاری حاڵەتی پووچی و بێهوودەیی (لا جدوی) دەبی، ئەسڵەن (لا جدوی) فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتییە، ئەم فەلسەفەیە لە ڕێگای ئەخلاق و عاتیفەی ئایینی بووەتە کارێکتەرێکی ستوونی لە کەسایەتی خەیاڵی و واقیعی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی، ئەمەش واتە بژی بۆ مردن نەك بۆ ژیان.

پاشان، دوای سەرنجدان جارێکی تر لەم پرسیارە کە دەڵێ مرۆڤ جگە لە قەپێلك و هەناسە شتێکی تر زیاتر نیە، خەیاڵمان بۆ ئەوە دەڕوا، لە ڕوانگەی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی هەموو کێشەیەکی ئۆنتۆلۆژی – Onthologie (فەلسەفەی بوون) لەم ڕستەیە کورت کرابێتەوە. ئەمەش واتە بێ مانایی بیرکردنەوە و قووڵبوونەوە و خەیاڵ کردن کە وەك شتی زیاد دێنە بەرچاو، سەرەنجام هیچ سوودێکی نیە، ئەمەش واتە ژیان لە ناو بێ مانایی و بۆ بێ مانایی، ژیان هیچ مانایەك نابەخشێ، سەرەنجام ئێمە دەمرین و قەپێلك دەمێنێتەوە و دەبێتە خۆراکی مار و مێروو، هەناسەش لەگەڵ با تێکەڵ دەبێ.

مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی نازانێ لەم دیوی ئەم پرسیارە جیهانێکی تر هەیە، نەك جیهانی ئایینی یان ئەوەی ئاین بە دوایدا وێڵە، بەڵکو جیهانی واقیعی مرۆڤ خۆی، ئەویش تێگەیشتنە لە خۆی بۆ خۆی، بە ئامانجی خۆی، لە پێناوی خۆی.

# کورد و ئیدیۆلۆژی ئیسلامی سیاسی

بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی لە کوردستان پێش ساڵی ١٩٩٢ لەسەر ئاستی هەندێ کەسایەتی و گروپی ڕاگەیەنراو و ڕانەگەیەنراو وەك بزووتنەوەی سیاسی هەبووە، ئەمەش زیاتر خۆی لە هەندێ کەسایەتی و گروپی میانڕۆ و سەلەفی و وەهابی و هەندێکی تری کەوتووی ژێر کاریگەری ئێران بەرجەستە کردبوو. بەڵام دوای ئەم مێژووە، هەر بە کاریگەری ئەم لایەنە دەرەکییانە، ئەم بزووتنەوانە لە کوردستان کەوتنە ناو چوارچێوەیەکی ڕوونتر و ئۆرگانیزەتر. هەڵبەت دەزانین دوای ساڵانی نۆوەدەکان کوردستان لە هەلکەوتێکی سیاسی ئابووری کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی زۆر خراپ دەژیا، بە کورتی کوێرەوەری ئابووری و کۆمەڵایەتی لە کوردستان بەرقەرار بوو، دەست تێوەردانی دەرەکی لە هەموو لایەکەو هەبوو لە کاروباری سیاسی کوردستان، ئەمەش ڕۆڵێکی مەزنی هەبوو لە دەرکەوتن و بە سیستەماتیك کردنی بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی بە هەموو جۆرەکانی لە کوردستان، بۆ نموونە ڕێکخراوی (رابیتەی ئیسلامی )لە کوردستان کە سەر بە باڵی ئیخوانی جیهانی بوو، لە ناکاو لە ناو ئەم ئاووهەوایە بووە حزبێکی سیاسی، ئەمەش خۆی لە (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان)دەبینێتەوە، سەرەڕای بوونی باڵی دیکەی بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان کە لە سەرەتای نۆوەدەکان بەم ناوە دەناسرا. لەم پرۆسە، ڕژێمی سعودی و ئێرانی، سەرەڕای جیاوازی مەزهەبی لە نێوانیان، هەر دوو لایان دەستێکی باڵایان هەبوو لە چاندنی ئەم بزووتنەوانە لە کوردستان و کردنیان بە بزووتنەوەی سیاسی ئۆرگانیزەکراو کە لە شێوەی پارتی سیاسی دواتر خۆیان نیشاندا.

هەموو بزووتنەوە سیاسییە ئیسلامیەکانی کوردستان لە باخەڵی ڕژێمی سعودی سەر بە ئیدیۆلۆژی وەهابی و ئێرانی دەرچوون، بە تایبەتی یەکەمیان، لەوەتەی ئەم (رابوونی ئیسلامی _ صحوە اسلامیە) لە سعودیە وەك دەوڵەتێکی ئیدیۆلۆژی لە شێوەی یەکێتی سۆڤییەتی جاران، ئەوان چۆن مارکسیزم و لێنینیزمییان بە جیهان بلاّدەکردەوە، ڕژێمی سعودیش بە هەمان شێوە، ئیدیۆلۆژی وەهابی، کە ئیدیۆلۆژییەکی بنەوانگرە Integriste بە پاکەتی تایبەتی بە جیهان بلاّو دەکاتەوە، بێگومان ئێستاش تێیدا بەردەوامن، ناوەڕۆکی ئەم ئیدیۆلۆژییەش لە جۆرێك لە کۆیلەبوونی هاوچەرخ شتێکی تر نیە، هەروەکو چۆن مرۆڤی سعودی و ئەوانەی لەوان نزیکن بە فیعلی لە ناو کۆیلەیی دەژین. بوونی بزووتنەوە ئیسلامیە توندڕەو Extremistes بنەوانگر، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و پاکستان و ئەفغانستان، هەر هەمووی بە پارەوسامانی پیترۆدۆلاری عەرەبی سعودی دروست بوون، لە زوویێکەوە، بە تایبەتی لە هەشتاکان، ڕژێمی سعودی یەکێکی وەك (بن لادن) دەنێرێتە ئەفغانستان بۆ یارمەتی دانی بزووتنەوەی ئیسلامی تەقلیدی کە خەباتیان دەکرد دژی کۆمۆنیستەکان و دژی یەکێتی سۆڤییەت تاکو لە ئەفغانستانیان دەرکەن. بن لادن ئەوسا سەر بە دەزگای هەواڵگری ڕژێمی وەهابی بوو، بەو ناوە چووبووە ئەفغانستان تا یارمەتی ئەفغانەکان بدا، بەلاّم، بن لادن، لەم پرۆسەیە، دوای ڕاستەوخۆ کەوتنە ناو پرۆسەیەکی سیاسی ئاینینی تر، دوای گەڕانەوە جارێکی تر بۆ فیکری سەلەفی و وەهابی، تەعالیمەکانی سەلەفی لە مێژووی فیکری ئیسلامی و فیکری ئوسولی ئیسلامی، نەك هەر ئاراستەیەکی تر دەداتە ڕوانینی خۆی کە بۆ هەموومان ئاشکرایە، لە ڕژێمی سعودی خۆیشی هەڵدەگەڕێتەوە، بەو مانایەی ڕژێمێکە لە بنەما فەلسەفییەکانی فیکری وەهابی و سەلەفی و بنەوانگر دوور کەوتۆتەوە. ئەوەبوو ئەو ئاگرەی ڕژێمی سعودی بۆ خۆیان لە جیهان هەڵیانکرد، لە ڕێگای گروپی (ئەلقاعیدە) بۆ خۆشیان گەڕایەوە، کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە. (سەیری دوا خۆتەقاندنەوە بکە لە چەند مانگی ڕابردوو لە سعودیە، لە مانگی حەوتی ٢٠٠٩). تا ڕادەیەك دەشێ هەمان خوێندنەوە بۆ حاڵەتی

دەرکـەوتنیان لـە کوردسـتان بکـەین، هەڵبـەت وێـڕای لەبەرچـاوگرتنی بـوونی شانسێکی کەمتر بـۆ کـاری ڕێکخراوەیـی چـەکداری ئۆرگـانیزەکراو، بێگومـان ئەمەش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خودی کۆمەڵی کورد و تا ڕادەیەك بە هێـزی حیزبە کوردستانیە عەلمانیەکان و هەروەها بۆ ئەو شێوە و تایبەتمەندییەی ئیسلام وەك ئایینێك لە ناو کورد هەیەتی کە زۆر کەم هەڵکەوتێکی ئوسولی لە مێژووی خۆی وەرگرتووە. سەرەتاکانی ئەم بزووتنەوەیە لە سـەر ئاسـتی کەسـایەتییەکان سەری هەڵدا کە باوەڕیان بە وەهابیزم و هەبوو، ئەمـەش هـەموو ئیخوانـەکان و سەلەفییەکان و تەکفیرییەکان دەگرێتەوە. بێگومان، ئەم دیاردەیـەش، هـەروەکو چـۆن بـۆ باشـوری ڕۆژهـەلاتی ئاسـیا و پاکـستان و ئەفغانـستان نوێبـوو، بـۆ کوردستانیش نوێ بوو، لـە هـەمان کـات غـەریبیش بـوو بـۆ مرۆڤـی سـادەی موسلمانی کورد، چونکە لە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی و کوردستانی، ئـایین هەمیشە ئامادەیی هەبووە، بەلام ئەم ئایینە، یان ئەم ڕووانینـە قـەت خـۆی بـە دوژمنی کوردایەتی نەزانیوە، قەتیش هەولی نەداوە جێگـا بـە کوردایـەتی لـەق بکا، لە هەمان کات کوردایەتیش ئەم ڕووانینەی ناوەوەی خۆی لەمەڕ ئـایین بـە دوژمنی خۆی نەزانیوە، چونکە زۆر بە سادەیی لە ناو کـورد ئـایین هـەردەم وەك دەستورێك و نەریتێکی کۆمەلایەتی هەبووە، یان شێوەی داب و نەریتی تەقلیدی وەرگرتووە، وەك ژن و ژنخوازی و خوداپەرستییەکی تەقلیدی و پاراسـتنی نـەوە و بلاوکردنەوەی نەخلاقی نەریتخوازی ئیجابی، واتە ئایین لە نـاو کـورد قـەت بـۆ ئاستی ئیدیۆلۆژی سیاسی و کاری سیاسی ئۆرگانیزەکراو بـەرز نەکراوەتـەوە. بـە پێچەوانەوە دەبینین، ئەمڕۆ، لە گـەڵ بلاوبوونـەوەی سـەلەفییەت لـە کوردسـتان نـەخلاقێکی کۆمەلایـەتی ئـایینی سـلبی لـە نـاو کـورد بـلاو بۆتـەوە، مـەلا سەلەفیەکان، وێڕای ڕیشی پەرش و بلاو، لە مینبەری هەندێ لە مزگەوتـەکان و پلاتفۆرمی هەندێ لە کەنالەکان پڕ بە دەنگی بەرز هاوار دەکـەن. ئەمـە ئیمـڕۆ بۆتە سیفەتێکی مەلای وەهابی و سەلەفییەکان کە بە دەستی دەرەوە، بە پـارەی پیترۆدۆلاری سعودی لە ناو کورد چـێنراون. یـەکێکی دی لـە تایبەتمەندییـەکانی کورد کە ئایین قـەت بەرزنەبۆتـەوە بـۆ ئاسـتی ئیـدیۆلۆژی سیاسـی بنـەوانگر،

دەگەڕێتەوە بۆ بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد خۆی، ئەگەر سەرنج بدەین، لە مێژووی ئەم دوو سەد ساڵەی دوایی، سەرکردەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی لە ناو خێزانە ئایینییە ئەریستۆکراسە کوردەکان و تەریقەتەکان سەریان هەڵداوە. ئەمانە خۆیان بە خاوەنی گەلی کورد زانیوە.

یەکێکی دی لەو هۆکارانەی کە وایکردووە پرۆسەی سیاسی نەتەوایەتی لە کوردستان لەسەردەمی دروستبوونی ڕێکخراوە سیاسیەکان بە ئاراستەی ئیسلامی سیاسی بنەوانگر و ئوسولی نەچێ، ئەو ڕوخسارە سیاسی و ئەو شێوە ئیدیۆلۆژییە سیاسییەیە کە بزووتنەوە و ڕێکخراوە سیاسییەکانی لێ دروست بووە : ئەمانەش دەشێ بە دیموکراتەکان و شۆڕشگێڕەکان و ڕزگاریخوازەکان و چەپەکان ناویان بهێنین، ئەمانە کە هەموو حزب و گروپە نیشتمان پەروەرەکانی لێ دروست دەبێ، قەت بە ئاراستەی دژایەتی بەهێز و ئوسولی ڕووبەڕووی ئایین نەبوونەتەوە، هەڵبەت لە کوردستان، بەڵکو بۆ پشتگیری میللی ڕێزیان لە باوەڕی ئایینی کوردەکان گرتووە، زیاتر وەك داب و نەریتی کۆمەڵایەتی کوردەواری بەرامبەر بە ئایین هەڵسوکەوتیان کردووە. لەبەر ئەم هۆکارە و هی تریش، بە قەناعەتەوە دەڵێم، ئیسلامی سیاسی لە کوردستان، چاندن و گەشەسەندنی بە کاریگەری دەرەکی بووە، ئەمەش هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ پیترۆدۆلاری سعودی و ڕژێمی مەزهەبی ئێران.

هۆیەکی تری مێژوویی کە وا دەکا باشتر لە پەیوەندییەکان بگەین ئەوەیە، لەسەدەی هەژدە (محمد عبدالوهاب) ڕوو لە کوردستان دەکا، پێش ئەوەی بچێتە هیند و ئێران، ماوەیەك لە شارەزوور دەمێنێتەوە، بەڵام کە دەبینێ کەس بەرەوپیری تەعالیمەکانی ئەو ناچێ، خێرا هەست دەکا هەرگیز لە ناو کورد جێگای ڕووانینی ئەو نابێتەوە، سەرەنجام بە خێرایی کوردستان بەجێ دەهێڵێ. لەم دیاردەیە تێدەگەین کە مەلا و شێخ و پیاوانی تەریقەتە کوردییەکانی سەدەی هەژدە زۆر لەو مەلا سیاسییانەی ئەمڕۆ کە سەرپەرشتی چەند گروپ و حزب دەکەن، زیرەکتر بوونە، ئەوان ڕاستەوخۆ هەستیان بەوە کردووە، نزیکبوونەوە لە ڕوانینەکانی وەهابی دەرچوونە لە ئیسلامی تەقلیدی. بێگومان ئەم دیاردەیە جیا

نیە لەو پرۆسە سیاسییە ئیسلامییە ئوسولییەی ئەمڕۆ لە کوردستان هەیە، بە تایبەتی لە دەرکەوتنی، بێگومان بە شێوە ئۆرگانیزەکراوەکەی، کە ساڵانی کوێرەوەری کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی نۆوەدەکان، دوای جەنگ، بە پلەی یەکەم بە پارەی پیترۆدۆلاری عەرەبی سعودی و پشتگیری ئێرانی مەزهەبی، لە ناو کۆمەڵی کورد چێنران. هەڵبەت لەم ڕووەوە نابێ ڕۆلی ناڕاستەخۆی هێزە نیشتمان پەروەرە کوردییەکانیش لەبیر بکەین، لە ئەنجامی لاوازی و ناکۆکی نێوان خۆیان، دەستێکی یاریدەدەریان هەبوو لە بلاوبوونەوەی ئیسلامی سیاسی لە کوردستان. تاقە شتێك ئەم هەلکەوتە ناجێگیرە بگەڕێنێتەوە، گەڕانەوەی حیزبە ئیسلامییە کوردییەکانە بۆ مێژووی کورد خۆیان، گەڕانەوە بۆ ئەو مۆدێلە ئیسلامییە سادەیەی کە لە ناو کورد وەك کولتوور هەمیشە هەبووە. دواجار ئاوەدانی و سەقامگیری، هەموو ڕوانینێکی بێگانە هەڵدەوەشێنێتەوە.

لە لایەکی تر زۆرجار پرسیاری ئەوە دەکرێ بۆچی ئیسلامییە سیاسییەکانی کوردستان نەیانتوانی فۆرمێکی دیکەی هاوچەرخ بدۆزنەوە کە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی کوردی بگونجێ، ئایا مەسەلەکە پەیوەندی بە وابەستەییە بە هێزە ئیسلامییە دەرەکییەکان یان ئەوان نایانەوێ بگەڕێنەوە بۆ مێژوو و تایبەتمەندی کوردی لەم بارەیەوە ؟

بە پێی خوێندنەوەی ئێمە، کوردەکان هەروەکو چۆن لە سەردەمی دەرکەوتنی ناکۆکی مەزهەبی (لە سەدەی پانزە و شانزەی زایینی)بەڵکو زووتریش، لە نێوان دوو مۆدێلی مەزهەبی جیا کە خۆی لە شیعیزم (بە نوێنەرایتی سەفەوییەکان) مۆدێلی عوسمانی، یان ئیسلامی ئۆرتۆدۆکسی (تەقلیدی) دامەزرابوو، هەمیشە لە بەرگری کردن و نەتوانەوە بوون لە ناو ئەم یان ئەویتر، ئایین قەت نەبووە داینەمۆیەکی ئیدیۆلۆژی و سیاسی بۆ کورد لە ڕێگەی ئەمەوە بتوانێ ناسنامەیەکی سیاسی فراژووی پێ دروست بکا وەك چۆن فارسەکان بە قووڵی کەوتنە ناوی، یان وەك چۆن تورکەکان لە ڕێگای ئەمەوە سەرکردایەتی خەلافەتی ئیسلامی جیهانییان پێ دەکرد، کورد لەم پرۆسەیە، سەرەڕای هەوڵی پاراستنی تایبەتمەندی خۆی تەنیا ئەوەندەی پێکرا نەتوێتەوە، بێگومان کۆمەڵێك کارێکتەر

هەبوون کە یارمەتی کوردیان داوە بەم ئاراستەیە بڕوات کە ئەمڕۆ لە ژیانی هاوچەرخی خۆی ئەم هەڵکەوتە ئایینەی هەبێ کە دەیبینین. ئەم هۆکارانەش کۆمەڵێکن کە پێویستە دەست نیشانیان بکەین، کە تا ڕادەیەکی زۆر ئەمە پەیوەندی بە مێژووی سیاسی ئەم چەند سەد ساڵەی دوایی هەیە لە پەیوەندی لەگەڵ ئایین و مەزهەبەکان:

یەکەم : جیۆپۆلەتیکی کوردستان، کە هەردەم یاریدەدەر بووە بۆ ڕاپەڕین و مل نەدان بە ئیدیۆلۆژی فەرمانڕەوا لە میترۆپۆلەکانی فارس و عەرەب و تورك. نەبوونی دەسەڵاتێکی مەرکەزی بەسەر هەموو کوردستان ڕابگا، بوونی ئایینزای تایبەتی Croyance و زۆر لە کوردستان کە هەردەم کۆنترۆڵی باڵادەستی مەزهەبێکی دیاریکراوی کردووە قورسایی و ڕکێفی تەنیا لە چێوەیەکی دیاریکراو بێنێتەوە و نەپەڕێتەوە بۆ هەرێمە جیاجیاکان وەك : ئایینی کریستیانی، عەلی ئیلاهی (یارساکان کە ئەندێکیش بە هەڵە پێیان دەڵێن ئەهلی هەق) عەلەوی، ئێزیدی، شیعەی حەفت ئیمامی وەك چۆن لە ناوچەی کرند و لە ناو شەبەکەکان هەیە. سەرهەڵدانی تەریقەتەکان (نەقشبەندی خالیدی موجەدیدی و قادری) وەك فۆرمێکی سیاسی تایبەت بە کورد خۆی، کە دەشێ بە دوایین هەوڵێکی سیاسی کورد دابنرێ بۆ دروستکردنی ناسنامەیەکی کوردی و دواجار دەوڵەتی کوردی، ئەم بزووتنەوانەی دوایی سەرەڕای بە هێز دەرکەوتنیان و بوونی گوڕو تەوژمێکی دینامیکی سیاسی تیایاندا، قەت بۆ ئەو ئاستە فراژوویان نەکرد لە هەژموونی سیاسی میترۆپۆلەکانی سەفەوییەکان و عوسمانیەکان ڕزگاری بێ. دواجار دەشێ ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدولای نەهری بە دوا ڕاپەڕین دابنرێ لەم ڕووەوە بەرەو دەربازبوون لەم هەژموونە مەزهەبیەی لەسەر کوردستان قورسایی هەبوو. لە نێو ناکۆکییە مەزهەبییەکان، کورد هەردەم ڕوانینی بەرەو ئەو ئاراستەیە چووە پێچەوانەی خۆی نەبێتەوە، لەم پرۆسە دوور و درێژە تا ڕادەیەکی زۆر کورد سەرکەوتوو بووە، سەرەڕای ئەوەی جار بە جار زەبری گەورەی پێکەوتووە، بەڵام ئەم زەبرانە قەت نەگەیشتونەتە ئەو ئەو زەبرە گەورەیەی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم پێی کەوتووە، ئەمەش لەبەر هۆیەکی زۆر سادە،

چونكە پێش ئەو سەردەمانە سەلەفییەت و وەهابییەت و ناسیۆنالیزمی عـەرەبی و فارسی گاریگەرییەكی ئـەوتۆیان نـەبوو، بگـرە هـەر نـەیان بـوو، بـەڵكو لـە سەردەمی بە دیاركەوتنیان بوون. ناسیۆنالیزمی عەرەبی ڕووی دووەمی بریتییـە لە سەلەفییەت و وەهابیزم، شیعیزمیش واتە ناسیۆنالیزمی فارسی. هـەر لەبـەر هەمان ناكۆكی ئایینیشە كە دەبیـنین ناسـیۆنالیزمی كـوردی كـە سـەرهەڵدەدا، لەسەر خاك و ڕووبەرە كۆنەكانی بلاوبوونەوەی تەریقەتە كوردییـەكان سـەقامگیر دەبێ، یان سفێری جوگرافی خۆی دیاری دەكا، ئەمەش سێكوچكەیەكی جوگرافی زۆر سەرەنج ڕاكێش دروست دەكا كە تا ڕادەیەكی گەلێك زۆر هەموو كوردسـتان دەگرێتەوە، تەنیا ئەو شوێنانە ناگرێتەوە كە كوردە شیعەكان و ئایینزاكانیان تێدا جێگیربووە، ( واتە لە مـاكۆوە بـە تێپـەڕبوون بـە مـەهاباد تـا سـنەومەریوان، لەوێشەوە بە تخوبی چیای حـەمرین هەڵدەكـشێ تـا دەگاتـە ناوچـەی جـەزیرە و لەوێشەوە جارێكی تر لە باكوری كوردسـتان بـۆ مـاكۆ.) سـەرەنجام، سـەرەڕای كزبوونـەوەی هـەژموونی ئـایینی لـە نـاو بزووتنـەوەی ناسـیۆنالیزمی كـوردی لەسەردەمی هاوچەرخ، لەگەڵ ئەمەش دیاردەیەك هەیە كە وا دەكا خوێندنـەوە و بۆچوونەكانی ئێمە بە ڕاستەڕێی خۆیدا بگەیەنێ، ئەمەش بریتییە لـەوەی : ئایـا ئێوە قەت بیر لـەوە كراوەتـەوە بۆچـی خێزانێكـی ئەریـستۆكراسی نەقـشبەندی خالیدی موجەددیدی ڕابەرایەتی پارتی دیموكراتی كوردستان دەكـا، یـان یـەكێكی دیكەی قادری ڕابەرایەتی یەكێتی نیشتمانی كوردستان دەكا ؟! لە لایەكی دیكە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی گۆڕان كە لە نـاو هـەناوی یـەكێتی دەرچـوو، وەك ئـەو ئینقلابە نایەتە بەرچاو كە نەقشبەندییە خالیدییـەكان لـە سـلێمانی لـە دەیـەی سێیەمی سـەدەی نۆزدەم دژی قادرییەكان كردییان، سـەرەنجام مـەولانا ڕووی لـە تاراوگە كرد. بە پێی لێكدانەوە، ئەگـەر مەسـەلەكەم لـێ بـە قـولگێر و سـادە وەرنەگیرێ، لەوباوەڕەم، دەبێ سەرەنجام نەوشێروان مستەفا ڕوو لە تاراوگـە بكـا. هەروەكو پێشتریش جارێكی تر ئەمـەی كـردووە. یـانیش دەبـێ پەیماننامەیـەك لەگەڵ كۆنە نەقشبەندییەكانی خۆی ببەستێ، واتە دەبێ لەگەڵ پارتی ئـەم كـارە بكا، ئەمەش بۆ ئەوەی لە هەژموونی قادرییەكان ڕزگاری بێ كە دەكا یـەكێتی.

ئەم نموونەیەی سەرەوەم بۆ ئەوەبوو، بە پلەی یەکەم ئەوە ڕەپێش بکەم، کە بزووتنەوەو کەسایەتییە ئیسلامییە سیاسییەکانی ئەمڕۆی کوردستان، بە هیچ شێوەیەك ئاگایان لە پەیوەندی کورد و ئایینی ئیسلام نیە لەم هەزار ساڵە دواییی، ئەوان قەت لێکۆڵینەوەیان لەم بارەیەوە نەکردووە، کەسایەتی ئیسلامی کوردی ناناسن، ئەمەش لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، چونکە ئەوان بزووتنەوەیەك نین لە ناو کورد خۆی سەری هەڵدابێ، داواکاری کوردی بێ، بەڵکو بزووتنەوەیەکی غەریبن بە مێژوو و کەسایەتی ئیسلامی کوردی. کەسایەتی ئیسلامی کوردی : وەك کێ : وەك مەولانا خالید، شێخ عوبەیدولا، بارزانی، پێشەوا ...هتد. لە لایەکی تر، هەموو ئەم هۆکارانە کوردیان پاراستووە لەوەی خۆی بە لایەکدا ساغ بکاتەوە، ئەمەش ئەگەرچی کاریگەری لە گەشەسەندنی ناسنامەی سیاسی کورد کردووە، لەگەڵ ئەمەش لەسەردەمی هاوچەرخ بە دۆخێکی ئیجابی بۆ کورد گەڕاوەتەوە، کە هیچ ئایینێك یان مەزهەبێك قەت نەیتوانیوە پانتاییەکی جەماوەری بۆ خۆی دروست بکا. چونکە هەمیشە لە کوردستان ناکۆکییەکی مەزهەبی بێ توندوتیژی هەبووە، دواجار دروست بوونی ڕێکخراوی تەقلیدی کوردی ناسیۆنالیست و عەلمانی ( لایك - Laique) لەسەردەمی هاوچەرخ بە ئاراستەی بزووتنەوە و ڕاپەڕینە کوردییەکانی سەدەی نۆزدەم کاریان کردووە، هەموو ئایینزاو مەزهەبەکانی لە ناو خۆی تواندۆتەوە، لە هەمان کات خۆی وەك پارێزەری مەزهەبی زۆربە پیشان نەداوە. هەموو ئەم لێکدانەوەیە هیچ کاتێك نەبۆتە باکراوندێکی فەلسەفی سیاسی بۆ ئیسلامییە سیاسییەکانی کورد، لەبەر ئەوە دەبینین ئەوان لە ناو لاساییی کردنەوەیەکی پڕاوپڕی ترادیسیۆن و نەریتی ئیسلامی سیاسی عەرەبی و فارسی (کە دەکا ناسیۆنالیزمی عەرەبی و فارسی) خۆیان قەتیس کردووە.

بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم بارەیەوە، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ شوێنی کورد و پەیوەندی سیاسی و ئایینی کورد لەگەڵ سەفەوییەکان و عوسمانییەکان، ئەمەش وەك لاکردنەوەیەکە لەم ئاخاوتنە (خیتاب)، کە هەندێ جار، بەڵکو زۆرجار پەیوەندییە مێژوویییەکان یارمەتیمان دەدەن باشتر لە کێشەکان بگەین، بە

تایبەتی، ئەگەر وردتر بڕوانین، هەڵبەت بە مێژووی ئەم چەند سەد ساڵەی دوایی، دەبینین، لە مێژووی هەر میللەتێك کارێکتەری دیاریکراوی ئەو میللەتە سەقامگیر و جێگیر دەبێ، ئەمەش زیاتر وەك خاسییەتێکی شارستانی دەردەکەوێ کە پشتگوێ خستنی کارەسات دروست دەکا. لەمەڕ کورد و ئیسلامی سیاسی ئەم خوێندنەوەیە زۆر ڕاستە. ئێمە پێمان وایە، لە مێژوودا کورد لەگەڵ شیعیزمی سەفەوییەکان هەردەم لە شەڕوشۆڕدابووە، هەردەم پەیوەندییەکی خراپ هەبووە کە پڕ بووە لە چەوساندنەوە و ئەنفال کردن، دەیان شەڕی قەڵای دمدم لە نێوان کورد و فارسەکان هەیە. تازەترینیان بۆردوومانەکانی ئەم دواییەیە لە لایەن ڕژێمی سەدەکانی ناوەڕاستی ئێران. هەرچی پەیوەندی کورد و عوسمانیەکانە، ئەمەیان لەسەر بنچینەی هاوپەیمانی سیاسی بووە، ئەوەی ڕێگای بۆ ئەمە خۆش کردووە، نزیکی مەزهەبی بووە لە نێوان کورد و تورك، کە هەردوو لایان ئیسلامێکی ئۆرتۆدۆکسی بوونە، عوسمانیەکان بۆ دوور خستنەوەی فارسە شیعەکان هاوپەیمانی سیاسییان لەگەڵ کورد کردووە، کوردیش سوودی لەمە وەرگرتووە. ئیمپراتۆری عوسمانی مۆدێلێکی ئیسلامی تەقلیدی بووە و لەسەر بنچینەی مۆدێراسیۆن Moderation بنیاتنراوە، لە ڕووی سیاسییەوە فۆرمێکی سیاسی گەشەسەندوویان پراتیك کردووە کە سیستەمی ویلایەت بووە. بێگومان ئیمپراتۆری عوسمانی لە هەڵکشانی دوور نەبووە لە کاریگەری ڕۆمانی و بێزەنتییەکان، بەلام دیسان بنچینەی ئەم دەوڵەتە ئیسلامی تەقلیدی بووە. هیچ پەیوەندییەکی ئیتنیکی لە دەوڵەتی عوسمانی نادۆزرێتەوە، بەلای کەمی تا هاتنی تورکەلاوەکان کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری ناسیۆنالیزمی تۆرانی ڕەگەزپەرست، تەواوی میللەتانی ناو ئیمپراتۆر خۆیان بە عوسمانی لەقەڵەم داوە، هەتا ئەرمەنی و کریستیانەکانیش. ئیمپراتۆری عوسمانی لە ناو میللەتانی موسلمان وەك ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکای ئەمڕۆ بووە، زیاتر لە شەش سەد ساڵ فەرمانڕەواییان کردووە، بەردەوامیش ناکۆکییان لەگەڵ فارسەکان هەبووە، یەکتریان بە کافر و زەندیق لە قەڵەم داوە. لەو سەردەمە کوردستان ئۆتۆنۆمی تایبەتی خۆی هەبووە، هەڵبەت بە پێی ئەو پەیماننامەیەی لە نێوان

بیست و پێنج میرو پاشاو سولّتان و بەگ و خانی کورد و سولّتان سولەیمانی قانونی لە سالّی ١٥٣٢ مۆردەکرێ: ((... بەم جۆرە، بیست و پێنج میرنشینی "خان نشینی"ی کورد : بدلیس و نورمێ و عیتاق و ئامێدی و جەزیرە و ئەگیل و هوزان و گارزان و پالّو و سێعرەت و حسنکێف و مەیافارقین و جزیرەی ئیبن عومەر،...هتد، بە ئاشتی بە فەرمانڕەوایی عوسمانییەوە دەبەسترێن، بڕوانە ئیدریس بدلیسی، لە نووسینی محەمەد بایراقدار، لا ٢٠)) کە تێدا هاتووە، کوردەکان دەچنە ناو چوارچێوەی بەرگری میللی لە سنووری ڕۆژهەلاّت، ڕێگا لە شیعیزم دەگرن ڕوو لە کوردستان و خاکی ئیمپراتۆر بکا، لە بەرامبەر ئەمە کوردستان هێز و دەزگای عەدالّەت و سوپای خۆی دەبێ، بەشێك دەبێ لە هێزی گەورەی ئیمپراتۆر، بە کورتی فۆرمێکی فیدرالی لە نێوان کورد و عوسمانیەکان هەبوو، لەمەش بێگومان نزیکی مەزهەب یەکێ لە کۆلّەگەکانی سەرکەوتنی ئەم پەیوەندییە بووە. لە لایەکی تر، هەر لە زوویکەوە، عوسمانیەکان ڕووبەڕووی ئیدیۆلۆژی وەهابیەکان دەبنەوە، ئەم ڕووبەڕوو بوونەوەیە زیاتر لە دوو سەدەی خایاند تا سەرەنجام عەشیرەتی ئال سعود کە خۆیان بە موریدەکانی وەهابی دەزانی لە سەرەتای سەدەی بیستەم، لە سەروبەندی ڕووخانی ئیمپراتۆری عوسمانی بە یارمەتی ئینگلیزەکان لە دوورگەی عەرەبی دەولّەتی سعودییەیان دامەزراند. دواجار لێرەوە وەهابیەت وردە وردە لە خەو ڕادەبێ و دەکەوێتە ناو بوارێکی سیستەماتیك (واتە ئامادە بۆ ناردنە دەرەوەی ئیدیۆلۆژی خۆی کە بریتیە لە وەهابیزم) سەرەنجام لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم وەك دەولّەتێکی ئیدیۆلۆژی، ئیسلامی سیاسی بە جیهان بلاّودەکاتەوە، هەلّبەت وێڕای توندوتیژی و فۆرمەکانی توندوتیژی تیرۆریزمی هاوچەرخی ئیسلامی سیاسی کە هەر ئەوان داهێنەر و بزوێنەری بوون. لێرەوە یەکەم گۆڕەپان بۆ بلاّوبونەوەی ئەم ئیدیۆلۆژییە میسرە، کە یەکەمین گروپی سەلەفی بەهێز دروست دەبێ کە تا ئەمڕۆش بەردەوام ناکۆکی لەگەلّ ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی میسر هەیە.

بە داخەوە ئیسلامیە سیاسیەکانی کوردستان بێ لێکدانەوەی مێژوویی و بێ لێکۆلّینەوە، دەیانەوێ ئەم ئیدیۆلۆژییە لە کوردستان بەرقەرار بکەن. ئەوان قەت

نەهاتوون لێکۆڵینەوەی ئەوە بکەن هەڵکەوتی ئیسلام لە ناو کورد چۆن بووە، ئەوان قەت ڕوو لە مێژووی خۆیان ناکەن و خۆیان بە تەواوی دادەبڕێنن لە مێژووی هەزاران ساڵەی کورد و ئیسلام. ڕاستەوخۆ خۆیان دەبەستنەوە بە تەعالیمەکانی (ابن تیمیە) و (ابن جوزی) و (محمد بن عبدالوهاب)، ئەمەش لە بنچینەدا زەمینەی فیکری و ئیدیۆلۆژی ناسیۆنالیزمی عەرەبییە، کە دواجار بینیمان دوای شەڕی ئەمریکا لەگەڵ ڕژێمە هەرە ناسیۆنالیست و فاشیستەکانی عەرەبی کە ڕژێمی عێراقە، وەك ئەزموونێك لە ناوچوو، لە بنچینەشدا ئەم شەڕە بۆ لە ناوبردنی ئەم ناسیۆنالیزمە ترسناکە بوو کە بەیداخی وەهابیزم بوو. ئەمڕۆش لە عێراق، بوونی ئەم هەموو تەقینەوانە لە لایەن گروپە ئیسلامیە عەرەبییە توندڕەوەکان، کە بێگومان و بێ شك سعودییە لە پشت هەر هەموویانە، وەك تەواوکردنی ئەو کارانەیە کە ناسیۆنالیزمی سەدامی نەیتوانی تەواوی بکا، ئەوان کۆتایی پێ دەهێنن.

سەرەنجام ئیسلامی سیاسی کوردیش، چونکە لەسەر بنچینەیەکی ئیدیۆلۆژی هێنراو دروست بووە و هیچ پەیوەندییەکی بە کوردەوە نیە، هەر هیچ نەبێ هیچ پەیوەندییەکی کولتووری و سیاسی لەم جۆرەی ئەمڕۆ هەیە و دەبینرێ لە مێژووی کورد نەبووە، دەشێ شکست بهێنێ، یان دوارۆژێکی ئەوتۆی نابێ.

ئیسلامی سیاسی لە کوردستان وەك ئیدیۆلۆژییەك لە ڕووی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی بە سەرهەڵدانی بە ئیدیۆلۆژی کەمالیزم دەچێ لە ناو تورکەکان، کەمالیستەکان بۆ سەرخستنی ئیدیۆلۆژی خۆیان، دژایەتییەکی شێتانەی مێژووی حەفت سەد ساڵەی عوسمانی و خەلافەتیان دەکرد، ئەوان بەسەر ئەم مێژووە پازیان دەداو دەگەڕانەوە بۆ مێژووی خۆیان لە ناوەڕاستی ئاسیا، دەگەڕانەوە بۆ سەردەمی "هوون و مەغۆلەکان"، (بڕوانە : ڕەگ و ڕیشەی ناسیۆنالیزمی تورکی، لە نووسینی : د. قەیس جەواد ئەلعەزاوی، وەرگێرانی : د. موحسین ئەحمەد عومەر، سەردەم، ٢٠٠٧)

سەرەنجام، بە گوێرەی حەتمییەتی گەشەسەندن و پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی مرۆڤی تورك، گەشەسەندن و ئاڵۆزبوونی پرۆسەی سیاسی لە تورکیا

خۆی، دواجار ئیـدیۆلۆژی کـەمالیزم خـۆی بـە دەسـتی عوسمانیـە (ئیـسلامیە) هاوچەرخەکان لەم سی ساڵەی دوایی لە ناوچوو، ئەگەرچی هێشتا گیانێکی تێـدا ماوە و هێشتا هەر هەناسە دەداو لە ڕێگای سوپای ئیدیۆلۆژی دەوڵـەتی تورکیـا تەعبیر لە خۆی دەکا. هەرچی ئەمانەن، واتە : ئیسلامییە هاوچەرخە تورکەکان، بە پێچەوانەی کەمالیستەکان مێژووی سەردەمی عوسمانی بە هی خۆیان دەزانن.
لـەو بـاوەڕەم بزووتنـەوەی ئیـسلامی سیاسـی لـە کوردسـتان بـە هـەموو جیاوازییەکانی، ڕووبەڕووی هەمان ئەزموون دەبێتەوە، چونکە تـاکی کـوردیش، ئەگەر لە ناو سەقامگیری و ئاوەدانی درێژە بە ژیانی خـۆی بـدا، ناسـنامەی لـە خەتەردا نەبێ، بە هەمان شێوەی تاکی تـورك، عـەرەب، فـارس، بیردەکاتـەوە، نایەوێ کۆیلەی هیچ ئایدیا و ئیدیۆلۆژییەکی هێنراو بێ کـە لەگـەڵ ناسـنامە و داب و نەریتی نەگونجێ، دواجاریش هەر فکرێکی میانڕەو چ ئیـسلامی بـێ یـان لیبرالی لە ئاوهەوایەکی لەم جۆرە گەشە دەکات، ئەمەش هیچ خەتەرییـەکی بـۆ ناسنامە و مێژوو و شارستانی تایبەتی هیچ لایەك نابێت.
لێرەوە دەگەڕێمەوە بۆ پرسیاری بەرایی، لـەم ڕوانگەیـەوە، تێدەگـەین بۆچـی ئیسلامی سیاسی لە ناو کورد ناتوانێ یان نەیتوانیوە فـۆڕمێکی دیکـە دروسـت بکا ؟ زۆر بە سادەیی، کوردستان لە مێژووی خـۆی و لـە فەرهـەنگی ئـایینی و سۆسیۆسایکۆلۆژی خۆی قەت ئیدیۆلۆژییەکی دیـاریکراو نـەیتوانیوە ئاراسـتەی بزووتنەوە سیاسیەکانی بگرێتە ئەستۆی خۆی، شتێکی ئەوها لە کۆمـەڵی کـورد نـەبووە، بێجگـە لەمـەش، ڕێکخـراوە ناسیۆنالیـست و عەلمانییـەکان کێـشەی مەزهەبیان لە ناو خۆیان تواندۆتەوە. لە لایـەکی تـر دەگـوترێ گوایـە، هـەردوو حزبی ئیسلامی کوردی (کۆمەڵ و یەکگرتوو و ئەوانی تر) سەر بە ئیدیۆلۆژییەکی موعتەدیلی ئیسلامین و ترس لەوەدا نەماوەتەوە بـەرەو بنـەوانگری بگەڕێنـەوە، لەم بۆچوونە من دڵنیانیم، لەو بڕوایەم ئەوان دەبێ پێداچوونەوەیەکی گشتی بکەن بە فەلسەفەی سیاسی خۆیـان. ئـەوان دەبـێ پـێش هـەموو شـتێك، مـۆدێرن و هاوچەرخ خۆیان پیشان بدەن، دژایەتی ژن کوشتن بکەن و دژی فرەژنی بوەستنەوە، کوردایەتی دەبێ ببێتە ئاراستەی خەباتی یەکەمیان، باوەڕیـان بـە دیمۆکراسـی و

هەبێ و ئازادی تاکەکەس بپارێزن، گرینگی بە زانست بدەن و لە سەرووی هەموو شتێکیشەوە دژایەتی فیکری پڕوپووچ و خورافی ئایینی بکەنەوە، ئیسلام وەك ئازادییەکی روحی بناسێنن نەك وەك ئیدیۆلۆژییەکی ئامادە بۆ سەپاندن. لە سفێری ئیسلامی سیاسی جیهانی بێنە دەرەوە و هەموو پەیوەندییەك بە جیهانی ئیخوانییەکان و سەلەفییەکان وەهابییەکانی جیهانی بپچڕێنن، نەك هەر ئەمە پێویستە ناوی حزبەکانیشیان بگۆڕن، لە یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان بیکەنە (یەکگرتووی ئیسلامی دیموکراتی کوردستان)، لە جیاتی کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان، باشتر نیە بگوترێ (کۆمەڵی ئیسلامی دیموکراتی کوردستان)، دواجار بگەڕێنەوە بۆ مێژوو و فەرهەنگی کوردی نەك مێژوو و فەرهەنگی ئیسلامی سعودی و ئێرانی. بەم جۆرە دەشێ پەیوەندییەکان ئاراستەیەکی تر وەربگرن، بگەڕێنەوە ناو تایبەتمەندی کوردی، نەك هەر ئەمە بەڵکو دەشێ بەم جۆرە بتوانن مۆدێلێکی ئیسلامی کوردی ڕەپێش بکەن کە ژیان و ژیانەوەی تێدابێ. بەلاّم سەلەفییەت و وەهابیزم وەها دروست نەبوون گۆڕانی ڕادیکال لە خۆیان دروست بکەن. سەرەنجام بۆ زیاتر تێگەیشتن لە هەموو ئەم هەڵکەوتە سیاسی و فەرهەنگییانە، ئیمڕۆ بە کاریگەری ئیسلامی سیاسی جیهانی، لە ڕێگای سەرەنجدان لە ژیانی واقیعی و کۆمەلاّیەتی کورد، تا ڕادەیەك لە هەموو کوردستان، لە ڕیگای زۆر دیاردە و هەڵکەوتی ڕۆژانەی خەڵك گۆڕانێکی بەرچاو لە ناو کورد دەبینین کە بە ئاشکرا هەندێ خاسیەتی تازەی نێگەتیف کە بە ڕای من دووره لە کارێکتەری ئاسایی ئینسانی کورد و ئینسانی کوردی موسلمانی ئاسایی، دەبینرێن و هەستیان پێ دەکەین. هەموو ئەم خاسییەتانە سەرچاوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەلەفییەکان و وەهابیەکان و ئیخوانەکان. بەلاّم سەرەتا دەمەوێ باسی دیاردەیەکی تر بکەم کە سەرەنجی ڕاکێشاوم، ئێمە لە ناو کورد، لە مێژووی خۆمان هەردەم مەلای زیرەکمان هەبووە کە تا ئەو ئاستە ڕۆیشتووە بووەتە سەرۆك و رابەری کۆمەلاّیەتی کە هەموو ژیانی ئایینیان لە ناو کورد ڕێکخستووە. ئەسلەن هەتا پێش پەنجا ساڵێك بەر لە ئەمڕۆ، نوخبەی ڕۆشنبیرانی کورد لە مەلاکان پێکدەهات. تا ئێستا نەمبینیوە حزبە ئیسلامیە

کوردییەکان مەلاو شێخ و زاناکانی کورد بکەنە مەرجەعی فیکری و فەلسەفی خۆیان، یانی مەولانا خالید چی کەمترە لە محمد عبدالوهاب، هەڵبەت ئەگەر زۆرتر نەبێ بە هیچ شێوەیەك کەمتر نیە، لەمە دڵنیام، جیاوازییەکە هەمووی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، مەولانا خیتابێکی کوردی و کوردستانی هەبووە، کەچی حزبە ئیسلامیە کوردییەکان و ڕۆشنبیرەکانیان ئەمەیان پێ هەرس ناکرێ. بۆ ئەوان دیارە ئاسانترە بە دوای تەعالیمەکانی سید قوتب و کێ و کێی سەلەفی بکەون نەك بگەڕێنەوە بۆ فیکری مەولانا و شێخ عوبەیدوڵای نەهری و شێخ مەحمود و مەلای گەورە و مەلا فەندی و مودەریس و بارزانی ...هتد. بێگومان ئەمەش جۆرێکە لە سەر لێ شێوان، هەمان سەر لێ شێوانی سەردەمی چەپ و کۆمۆنیستەکانی کوردستانە، ئەوانیش زووتر، لە کاتێکدا لە کوردستان شتێك نەبوو بە ناوی پرۆلیتاریا، لە سلێمانی خۆپیشاندانیان دەکرد بۆ پشتگیری کرێکارانی بەرازیل، کوردستان لە کوێ و بەرازیل لە کوێ؟! وەك کورد دەڵێ (کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە !)

لەو بڕوایەم نوخبەی ڕۆشنبیری کورد، بە هەموو بزووتنەوەکانیان، دەبێ لەسەر ئێسك و پرووسکی خۆی هەڵسێتەوە و جارێکی تر لە دایك بێتەوە، لەو خەوە قورسەی تەڕاتێنی ئیدیۆلۆژی واگابێتەوە، سەیری خۆی بکا لە ناو جیهان کەوتۆتە کوێ ؟ لە خەوی کۆمەڵایەتی و خەوی مێژوویی قیت بێتەوە و سەیری ڕوخسارو گیانی خۆی بکا.

هەر ئەمڕۆ، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، ئەگەر سەرنجی ژیانی کورد بدەین، چ لە مێدیا و چ لە واقیعی ڕۆژانە، دەیان دیاردەی وەهابی و سەلەفی هەست پێ دەکەین، وەك بەردانەوەی ڕیشی پەرش و بڵاو ، وەعزدانی ئەخلاقی لە هەندێ لە کەناڵەکان لە لایەن هەندێ بە ناو مامۆستا کە شارەزاییان لە ئیسلام نیە، وەك هەمان ئەو دیاردەیەی لە میسر و سعودیە زۆر وڵاتانی تر هەیە کە وەهابی گەراو ڕێکخراوی لێ داناوە. فتوا دەرکردن بۆ هەموو دیاردەیەکی ڕۆژانە، دیاردەی ژن کوشتن و فرەژنی و زۆر ژن هێنان و بڵاوکردنەوەی دەیان و سەدان نامیلکە و کتێبی سەیر سەیر کە باس لە خۆشییەکانی دوای مردن دەکەن، سەیرکردنی

فیلمەکانی توندو تیژی گروپە ئیسلامیەکان، پشتیگری کردن لە خورافیات و فیکری پڕوپوچی ئایینی کە لە هیچ کتێبێکی ئایینی ئیسلامی بوونیان نیە. نمونە بۆ ئەمە : لە یەکێ لە کتێبەکانی وەهابی کە بەم دواییە دەرچووە و لە بازاڕ ڕەواجێکی زۆری هەیە : لە یەکێ لە لاپەڕەکانیدا ڕاچێتەیەکی وەك دەرمانی منداڵ نەبوون نووسراوە، ئامۆژگاری موسلمانان دەکاو دەڵێ : هەر کەسێ ڕۆژێ سێ جاران نان و هێلکە بخواو پێنج سەعات قورئان بخوێنێ، هەفتەی سێ ڕۆژ ئەم کارە بکا، بۆ ماوەی مانگێك، کۆتایی مانگ ژنەکە منداڵی دەبێ. ئیتر دەیان شتی سەیری وەك ئەمە. یان دیاردەی تازیە لە ناو کورد، کۆبوونەوە لە مزگەوتەکان و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ قورئان خوێندن، کە ئەمەیان دیارە بە کاریگەری وەهابیزم و ئیخوانەکان لە ناو کورد بلاوبۆتەوە، چونکە تازیەی ئاسایی لە ناو کورد قەت بەم شێوە نەبووە. پێشان خەڵك ڕاستەوخۆ ڕووی دەکردە ماڵی مردوو و سەرەخۆشییان لێ دەکرد و دەگەڕانەوە، بەلاّم ئێستا بە شێوازی ئیخوانی میسرییەکان لە کوردستان تازیە دەگێڕن. لە لایەکی تر لە بارەی گەشە نەسەندنی لێکۆڵینەوە لە ناو ئیسلامییەکان، واتە لێکۆڵینەوەی فکری و ئیسلامی لە ڕوانگەیەکی زانستییەوە، تا ئێستا لە ناو ئێمە، هەتا لە ناو عەرەب و فارس و تورکەکانیش بە ڕادەیەکی کەمتر، نەبۆتە نەریتێك کەسی پسپۆڕمان هەبێ لە بارەی ئیسلام وەك ئایینناسی، وەك فەرهەنگ، وەك مێژوو لێکۆڵینەوە لە ئیسلام بکا، واتە نەبۆتە نەریت ئیسلامەلۆگمان هەبێ وەك چۆن کوردۆلۆگمان هەیە. هەتا لە زانکۆکانیشمان بەشێك نیە بە ناوی ئایینناسی، دوور لە هەموو ئیدیۆلۆژییەك و باوەڕێکی ئایینی، ئایین بخوێندرێ، واتە زانستی ئایینی (تیۆلۆژی Theologie) بخوێندرێ. لەو بڕوایەدام کەمتەرخەمییەکی زۆر لەم بارەیەوە هەیە، هەتا زانکۆکانی کوردستانیش کەمتەرخەمن، ئۆروپییەکان بەش و پسپۆڕ و شارەزایان بە ناوی ئیسلامەلۆگ هەیە و زۆریش شارەزان لە ئیسلام. مەبەست لە ئیسلامەلۆگ وەك زانایەك لە دەرەوەی ئیسلام بڕوانێ بۆ ئیسلام نەك خۆی بۆ خۆی بڕوانێ، بێگومان جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ڕوانینێك لە دەرەوە بڕوانێ یەکێکی تر لە ناوەوە بۆ خۆی بڕوانێ.

## مانەفێستی ئەدۆنیس، مانەفێستی من...

... ئەو خاڵە لەبەرچاو دەگرم کە مرۆڤی کورد هەردەم لە ناو پێکهاتە و ژینگەیەکی جیۆسیاسی، سۆسیۆسایکۆلۆژی جیاواز ژیاوە لە چاو هاوسێکانی، ئەوان لە زووێکەوە دەرگاکانی مێژوویان بۆ کراوەتەوە، بەلام بە پێچەوانەوە، کورد تا دەگاتە ئەمڕۆش لە ناو قەتیسکردن یان خۆقەتیس کردنێکی مێژوویی ماوەتەوە، لەمەش بێگومان هۆکاری ناوەوە و دەرەوە دەستیان هەبووە، کە کورد زوو نەگا بە سەرچاوەکانی زانیاری، دروست نەبوونی مرۆڤی ڕۆشنبیری کورد، ڕۆشنبیرێك وەك کوردێك بژیێ، وەك مرۆڤێکی ڕۆشنبیری کورد بژیێ، وەك مرۆڤێکی ڕۆشنبینی جیهانی، سنوور بۆ فکر و ڕوانین هەڵوێستی خۆی دانەنێ، وەك با بێ، وەك ئاو، وەك خۆڵ و غوبار. کورد بێ، چەوساندنەوەی کورد و مرۆڤ، هەر مرۆڤێك قبول نەکا، چەوساندنەوەی کوردیش بۆ ئەوانی دی قبول نەکا. هەروەك چۆن ئازادی بۆ خۆی دەوێ، ئازادی بۆ ئەوانی تریش بووێ، دژی فکری پروپووچ بێ، دژی ئەفسون و ڕیاکاری بێ، دژی درۆ بێ، دژی ئەوە بێ خۆی لە چوارچێوەی حزبێك و ئیدۆلۆژییەك قەتیس بکا. دژی ئایین بێ وەك سەرچاوەیەکی چەوساندنەوە بۆ ئەوانی دی، دژی ئەوانەش بێ ئیمانداران بە ناهەق دەچەوسێننەوە. دژی هەموو ئەو کۆنانە بێ کە دەبێتە زنجیر و هەتا هەتایێ لە ملی مرۆڤ نابێتەوە، دژی بت و هەموو بتەکان بێ ، بتە جۆراو جۆرەکان، بە تایبەتی بتە ڕۆشنبیری و ئیدیۆلۆژییەکان. بە کورتی مرۆڤێکی هوشیار و ئازاد بێ، وەك ئاو بێ، وەك با، وەك خۆڵ و غوبار.

لەم پێشەکییە کورتە، دەمەوێ دەربارەی سەفەرەکەی ئەدۆنیس بۆ کوردستان و هەندێ ڕوانین و لێکدانەوە پێشکەش بکەم. من ئەدۆنیس دەمێکە دەناسم، لە سەرەتای نۆوەدەکان، ئەوسا کە قوتابی خوێندنی بالاّ بووم لە پاریس. ناسینەکەم لە یەکێ لە قاوەخانەکانی پاریس، لە شەقامی سان ژێرمەن، قاوەخانەی ( لا سازێس) بوو، شوێنی ئەدیبان و نووسەرانی فرانسی و بیانی، ئێوارەیەکی زستانی ساڵی ١٩٩٤، بە خۆم و وەرگێڕانی چەپکە شیعرێکی ئەو چوومە لای، ناسینێکی سەیر بوو، ئەویش پێی سەیر بوو، وتی: تازە تۆ قەت لە بیرناکەم. من شیعرەکانم بە عەشقەوە کردبوونە کوردی. نوسخەیەکی تایپکراوم پێشکەش کرد، ئەوەبوو، لەم هاتنەی بۆ کوردستان، چاپ کراو لە کاتی ئامادەبوونی خۆی بلاّوبووەوە(ستایشی شتە ڕوون و پەنهانەکان، بلاّوکراوەی چاودێر. ٢٠٠٩).
ناسینی من و عەشقم بۆ ئەدۆنیس دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هەرزەکاری، ئەوسا دەیان شتی ئەوم خوێندەوە، بەلاّم لەبەر زۆر شتەوە باش تێی نەدەگەیشتم، یاخود بلێم : جیهان و زمانی ئەدۆنیس لە سەرەوەی تاقەتی هەرزەکارێکی کەم عەرەبی زانی وەك من بوو، درەنگتر، ئەدۆنیس زۆرتر بۆ من ڕۆشن بووەوە، ئەمەش لە ساڵانی نۆوەدەکان و ساڵانی دواتر، زۆربەی نووسینەکانیم خوێندەوە، بە فرەنسی و بە عەرەبی، ئینجا تێگەیشتم ئەدۆنیس وەك زەریایەکە، مرۆڤێکە، سادە و ساکار بەلاّم قووڵ و پڕ لە پرسیار و ڕامان. مرۆڤێکە هیچ سنوورێك و قاڵبێك بۆ فیکر و ڕوانینی خۆی دانانێ، مرۆڤێکە هیچ سنوور بۆ هەڵوێستی خۆی دانانێ، هەڵوێست و هەڵوەستەو ڕامان و بڕیاری تاکەکەسی تەنیا لە لای خۆیەتی، بە داوی هیچ کەسێك ناجوولێتەوە، ئینجا ئەو داوە، داوی ئیدیۆلۆژی بێ یان ئاینی یان سیاسی، یان... دۆژمنی سەرسەختی چەوساندنەوەیە، ئیتر ئەو چەوساندنەوەیە هەر شێوە و جۆرێکی هەبێ، دژی ڕیاکاری درۆ و نواندن و لاف لێدانە، گەلێك زۆر دژی خۆیەتی، لەم ڕووەوە وەك سوفیەکان وایە، بەلاّم ئەدۆنیس سوفی نیە، بەڵکو هەمیشە پرسیار دەکا، دەگەڕێ، دادەمێنێ و ورد دەبێتەوە، جارێکی تر پرسیار دەکاو دەگەڕێ، بە دوای جوانی دەگەڕێ، بە دوای ئازادی دەگەڕێ، لەمەوە باشترین فۆرم بتوانێ نوێنەرایەتی جوانی بکا، شیعرە،

ئەمەش واتە ئازادی، ئازادیش واتە مرۆڤێکی ئازاد و سەربەخۆ دوور لە هەموو جۆرە ڕوانینێك مرۆڤ بخاتە ناو کاتیگۆرییەکی دیاریکراوی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، فکری، ئاینی...هتد. ئەدۆنیس : هەڵکەوتێکی هەیە وەك بایە، وەك خۆڵ و غوبار و ئاوە، بە ڕاستیش لە ناو فرەنسەکان بە (شاعیری با...) ناسراوە، دەزگای گالیماری فرەنسی، ئەنتۆلۆژییەکیان بە ناوی (یاداشتی با Le memoire de vent-) بۆ بلاّوکردۆتەوە. ئەم ئەنتۆلۆژییە وێڕای دەیان دەقی تری وەرگێڕدراوی ئەدۆنیس، زۆر ناسراون. بە گشتی فرەنسەکان زۆر بە پوختی و بە ئەمانەت و بە دڵسۆزی کاریان لەسەر ئەدۆنیس کردووە، هەموو ڕۆژئاوا بەم شێوە کاری لەسەر ئەدۆنیس کردووە، بە تایبەتی بە زمانەکانی ئینگلیزی و فرەنسی و ئەڵمانی و ئیتالی و ئیسپانی، لە ڕۆژهەلاّتیش بە ژاپۆنی و چینی و فارسی و تورکی. بە داخەوە ئێمەی کورد لە بەرامبەر ئەدۆنیس لە ناو هەمان کێشەی تایبەت بە خۆمان دەژین. لەو بڕوایەدام کورد تا ئێستا ئەدۆنیسی نەناسیوە. لەم نەناسینەش هەموو هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ، بێجگە لەو خاڵەی کە لە سەرەوە باسم کرد، نەبوونەوەی دەرگاکان لەسەر کورد، بۆ هۆکارێکی تریش دەگەڕێتەوە، ئەویش ئەوەیە بە پوختی کارمان لەسەر فکر و ئەدەبی ئەدۆنیس نەکردووە. ئەمەش لاوازی ئێمە پێش دەدات.

کارکردن لەسەر شیعرو فکری ئەدۆنیس وردەکاری و پوختەیی و زمانێکی ڕوون و شێوازێکی ڕوونی دەوێ، چونکە شێوازی ئەدۆنیس وێڕای کارکردن لەسەر لایەنی فۆرم و مانا، لایەنی هونەری، فیکری، شێواز، پوختی داڕشتن و سادەیی فۆرمولەکردن، زۆر پوخت و ڕێکە، بێ نوقسانی هەڵە و پەڵەیە، بێ ناڕوونی و تەعبیری چرووك و لاوازە، هەموو شتێکی ئەو وەك بلۆك و کۆنکرێتە، مانا بێ پایان درێژ دەبێتەوە و مەودا و ڕەهەندی لێ دەکەوێتەوە، قووڵ و سادەیە، هەموو ئەمانەش وێڕای پیشاندانی جورئەت و نوێخوازی. دەشێ لە لایەکی تر هەر ئەم هۆکارانە وابکەن وەرگێڕانی ئەدۆنیس زۆر ئاسان بێ بۆ هەر زمانێك، چونکە ئەدۆنیس لە ناو تەواوی شاعیران و بنووسانی عەرەب تاقە کەسێکە زۆر بە ڕوونی و بەرجەستەیی دەنووسێ، بەلاّم ڕوونی و بەرجەستەییەکی سادە و ئاڵۆز کە دەبێ

هەمان شت بۆ زمانی وەرگێڕدراو دروست بکرێتەوە. هەر لەم بارەیەوە، تێکستێك لە لای ئەدۆنیس زۆر بە زەحمەت تەواو دەبێ، ماوەیەکی زۆری دەوێ، بەلاَم کە تێکستەکە کەوتە دەست خوێنەران، واتە تەواوە و هیچی نوقسان نیە.

بە درێژایی ئەو ماوەیەی ئەدۆنیس لە هەولێر بوو، ئێمە لەگەلّ هەندێ لە هاوڕیان، لە هەموو دانتیشتنەکان لەگەلّی بووین. ئەوەی لەم سەفەرەی بە پلەی یەکەم منی هەراسان کردبوو، زوو زوو وەك پرسیار بە خەیالّمدا دەهات، ئایا شاعیرێك دەشێ بەم جۆرە قسە بکاو هەلّوێست وەرگرێ ؟ ئەم پرسیارەش وێڕای لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندییەکان و خاسیەتەکان و هەژاری و پێکهاتەی هاوچەرخی مرۆڤی کورد، وێڕای لەبەرچاوگرتنی لایەنی بلّیمەتی ڕێژەیی مرۆڤی کورد، بێگومان لێرەوە مەسەلەکە مرۆڤی کورد نیە وەك مرۆڤ، بەلّکو ڕۆشنبیری کوردە، لە ناو ئەمانەش شاعیر و نووسەران و هونەرمەندان بە پلەی یەکەم دێن، زوو زوو ئەو پرسیارەم بە خەیالّدا دەهات بۆ شاعیران و نووسەرانی کورد بەم جۆرە، بەم وردییە، بەم گران و سەنگینی و سادەییە نین، بۆ ئەوان نموونەی لەم جۆرەیان تێدا نیە ؟!

سەیرم دەکرد، ئەدۆنیس ینچینەیەکی فیکری و فەلسەفی ئالّۆز و توندوبەندی بۆ خۆی دروست کردووە، دایهێناوە، ئازار و مانووبوونێکی بێ سنووری بینیوە، تەنیا لە پێناوی ئەوەی سەرەتا ئینسان بێ، پاشان ئینسانێکی پوخت و سادە بێ، هەردەم لە خەباتی نوێخوازیدا بێ، نوێخوازییەکی ڕوون و هونەری، هەردەم هەقیقەتی بریندارکار بلّێ، هەقیقەتی بریندارکاربێ، برین لابەرێ و ژیان بگەڕێنێتەوە، شتێك بلّێ لە ئاستی کێشەی گەورەی ئینسان بێ، کێشەی ئینسان وەك وجود، وەك هەلّوێست، وەك ژیان بۆ خۆی بە هەموو شتە سادەو ساکار و ئالّۆزەکانی، نووسنەکانی بە ڕۆح و گیانی خۆی بپێوێ، تەنیا لە پێناوی ئەوەی ئینسان بێ، بواری سادەگۆیی و بێ مانایی نەداو بێ مانایایش بەو شێوە بلّێ و دایڕێژێتەوە وەك کێشەیەکی فیکری و ژیاری مرۆڤ، شتێك نەلّێ و نەنووسێ تەمەنی تەنیا ڕۆژێك بێ...

لە بەرامبەر ئەمە، دەمبینی ئەدیبان و نووسەرانی ئێمە چەندە سادە و ساکار و بێ مانان، چەندە بچووکن، چەندە کۆلەوارن لە تەعبیر، لە تەعبیر لە خۆیان و لە هەموو ئەوەی پەیوەندی بە جیهان و ژیانی ئەوانەوە هەیە. چەندە بۆ بەرهەم هێنانە ئەدەبی و هونەریەکانیان لە دارشتنی فیکری و فەلسەفی ڕەسەنی خۆیان دوورن، چەندە بە ئاسانی شتی کرچ و کاڵ دەنووسن و بە ناوی ئەدەب و داهێنان پێمان دەفرۆشن، نەك هەر ئەمە بەڵکو ئەوان هیچ ڕوانینێکیشییان نیە بۆ کێشەی مرۆڤی کورد، بۆ واقیعی مرۆڤی کورد، ئایدیۆلۆژیا چەند ئەوانی خواردووە، ئایین، فیکری پڕوپووچ، ئەفسوون و درۆ و ڕیاکاری چەند چۆتە ناو هەناویان. لە شیعر نووسین تەنیا وشە ڕیز دەکەن، لە ڕۆمان نووسین تەنیا خەیاڵ پلاوی دەکەن، زمان لە لایان بوونەوەرێکی مردووە، وەك هەر کەرستەیەکە زۆر بە هەرەمەکی بە کاری دەهێنن، بێ شێواز، بێ بیرو مانادار، بێ ئەندازەی دارشتنی مانا، بێ کارگردنی هونەری لە ئاستی زمان و ئاڵۆزی فیکر. خەیاڵ پووچ و کەم تەمەن، لەولاشەوە، بێ هەڵوێست، بێ ڕوانین و بێ خوێندنەوەی پەیوەندییە سیاسییەکان بە دروستی و تێوەگلانیان بە ئاسانی، بەرنگارنەبوونەی دۆگماکان، دۆگماکانی ئایینی، سیاسی، ئایدیۆلۆژی، دۆگما کۆمەڵایەتیەکان، زاتیەکان، دۆگماکانی نووسین و لاف لێدانی فیکری و تازەیی و ناوێزەیی ... هتد. چونکە ئەدۆنیس بە شاعیرێك و ڕۆشنبیرێکی ئیکۆنۆکلاست ناسراوە، واتە شاعیرێك و ڕۆشنبیرێکی داب و نەریت تێکشکێنەر، ئەمەش نەك بۆ دانانەوەی داب و نەریتێکی تر لە جیاتی و لە جێگای، بەڵکو دانانی ئازادی مرۆڤ لە جێگای، دانانی ئازادی بیرکردنەوە لە جێگای، ئازادی کە وەك ئاو، خۆڵ، ئاگر و با، کە پێکهێنەری بنچینەیین لە مرۆڤ، گێڕانەوەی زیندوویتی و خۆشەویستی، ئازادی واتە خۆشەویستی، شیعر واتە خۆشەویستی، واتە ئازادی... ئەدۆنیس دەڵێ (حیجاب نەك هەر سەر دادەپۆشێ، بەڵکو لە بنچینەدا مێشك دادەپۆشێ) واتە سەرچاوەی بیرکردنەوە دادەپۆشێ، ڕوانین دادەپۆشێ، ئازادی و مانا دادەپۆشێ، هەتا ئیمان و ڕۆحیش دادەپۆشێ... بە پێچەوانەوە، حیجاب بت و بەرد و کلێشە و ترس و قالب و درێشە و درۆی ئارایشکراو بە جوانی و ئیمانی

ساختە و فیکری پڕوپووچ لە ناو مێشك دادەنێ و دەیانشارێتەوە، پاشانیش دەبنە ڕێسای ڕێگاو ژیان، بەڵام ژیانێکی هەژار و کۆڵەوار.

ڕۆشنبیر ئەگەر جورئەت و داهێنان و ئازادی و خۆشەویستی و عەدالەت بلاّونەکاتەوە، بەرهەمەکانی بە کەڵکی چی دێن!

لێرەوە من نموونەیەك دەهێنمەوە بۆ ڕۆشنبیری کورد، یەکێ لە شاعیرەکان دەکەمە کەرستەی ئەم نموونەیە، ئەمەش شێرکۆ بێکەسە وەك نموونەیەکی دیاری شاعیر و ڕۆشنبیرێکی کورد. شێرکۆ بێکەس یەکێ بوو لە پێشوازیکارانی ئەدۆنیس، وەك سێبەری ئەو دەهاتە بەرچاو، بۆ دەڵێم سێبەر، چونکە دەمەوێ لەم نموونەیە ئەم بەراوردکارییە پیشان بدەم. (بێگومان ئێمە مەبەستمان شێرکۆ بێکەس نیە وەك مرۆڤ، بەڵکو شێرکۆ بێکەسی شاعیر و ڕۆشنبیر). دەمێکە مێدیای کوردی کە ناوی شێرکۆ بێکەس دەهێنن دەنووسن (شاعیری گەورەی گەلەکەمان)، ئەم ڕستەیە لە ڕستەیەکی ئارایشکراو بە وەهمێك زیاتر نیە، چونکە شێرکۆ بێکەس تا ئێستا نەیتوانیوە تەجاوزی هێڵی حزبی خۆی بکا، وەك شاعیرێکی یەکێتی دێتە بەرچاو نەك (شاعیرێك و ڕۆشنبیرێکی کورد و بۆ هەموو کورد) چونکە من قەت شێرکۆ بێکەسم نەبینوە بچێتە شنگار، لەوێ شیعر بخوێنێتەوە، بێتە هەولێر دوور لە پسوولەی حزبی پیاسەیەك لەگەڵ نووسەران و شاعیرانی ئێرە بکا، لە دهۆك وەك شاعیرێك و ڕۆشنبیرێك لەگەڵ ڕۆشنبیرانی ئەوێ دانیشێ و گفتوگۆ بکا. لەبەر ئەوە باشترە بگوترێ (شاعیری گەورەی یەکێتی) لەوبڕوایەم ئەمە زیاتر هەقیقەتی تێدایە وەك لە شاعیری هەموو کورد. بێگومان ئەم بەراوردکردنە بە ئەدۆنیس خەیاڵم بۆ ئەوە دەبا ئەم وەهمە لە بن ئەم ئارایشتە ببینم، ئەمەش هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە کە لە سەفێری شێرکۆ بێکەسن، شیعر بە ڕادان دەدەن و بە ناو کورد بڵاوی دەکەنەوە، هەڵبەت بە پێچەوانەوەش ڕوانینم ئەوانەش دەگرێتەوە کە لە سەفێری پارتین، وەك حزبێکی هاوشانی یەکێتی. من لە چاو و ڕوانین و جورئەتی فیکری ئەدۆنیس و شیعری ئەو بەو شێوە دەبینم، شاعیرێکی داهێنەر و ڕۆشنبیرێکی بە جورئەت دەبێ تەنیا بۆ کورد بێ وەك نەتەوە و وەك مرۆڤ، بۆ کورد و بۆ هەموو جیهان بێ، بۆ هەموو

مرۆڤ بێ، لە سەرەوەی هەموو جۆرە کاتیگۆرییەکی حزبی و ئیدیۆلۆژی بێ، دژایەتی هەموو جۆرە ئایدیا و بەربەستێکی سیاسی و ئیدیۆلۆژی و ئایینی... هتد بکا، سنوور بۆ کورد و مرۆڤی کورد دابنێ، جیهانیش لەم پەیامە ئازادی و عەدالەتی لێ بخوێنێتەوە. (چونکە ئەدۆنیس شاعیری عەرەبە نەك شاعیری ڕژێمە عەرەبییەکان).

بە گشتی لەم بەراوردکردنەم، هەست دەکەم زۆربەی شاعیران و ڕۆشنبیرانی کورد، سنوور بۆ خۆیان دادەنێن، سنوورێك بۆ زمان، یەکێك بۆ شێواز، یەکێك بۆ مانا، یەکێك بۆ فیکر و ڕوانین، شانازی بە بەرهەمی کرچ و کاڵ دەکەن، شانازی بە خۆیان دەکەن، لە کاتێکدا دەبێ خەڵك شانازییان پێوە بکا. مەبەست لەم ڕوانینە ئەوەیە، وێڕای خۆزیندانی کردن لە ناو وەهمی زاتی خۆیان، شتێك بەرهەم دەهێنن لە ئاستی کێشەی ئینسانی کورد نیە.

لەم هاوکێشەی باسی دەکەم، ئەدۆنیس جوانتر لە شاعیران و ڕۆشنبیرانی کورد خۆیان، نوێنەرایەتی ویژدانی کوردی دەکرد وەك مرۆڤێك، وەك جیهانێك. ئەو ماوەیەی لە هەولێر بوو، لە کۆمەڵێك سیمینار و دانیشتن، لە کۆلیژی زمان، لە نووسەران، لە هۆڵی هوتێل چوارچرا، کۆبوونەوەی لەگەڵ ژنان و ئافرەتان، بە جدی و زۆر بە وردی ڕای خۆی نیشان دەدا، بێ ترس و بێ سڵەمینەوە باسی هەموو شتێکی دەکرد ئەمڕۆ کۆمەڵانی خەڵکی موسڵمان بە هەموو نەتەوەکانیان دووچاری بوونە، ئەمەش لە کێشە سیاسییەکانەوە بگرە تا دەگاتە ئایین و هونەری شیعری...هتد. لە کاتێکدا هەستم دەکرد نووسەران و ڕۆشنبیرانی ئێمە بۆ لەم ئاستەدا نین لەگەڵ ئەو گفتوگۆ بکەن، سەیرم پێ دەهات، شاعیران و نووسەرانمان، ئەوانەی بە تایبەتی لە پێشەوەن و وەك نوێنەری کولتووری کوردی خۆیان ڕەپێش دەکەن (ئەگەرچی کولتوری کوردی هیچ نوێنەرێکی نیە لە خۆی زیاتر)، چەندە بەدبەخت و بێ زمان و بێ ڕۆشنبیرین، بۆچ ئێمە ناتوانین کێشەکانمان بناسێنین، بۆ لە ئاست ئەو واقیعە نین ڕێگاکانی دونیا لە پێش مرۆڤی کورد ڕۆشن بکاتەوە.

ئەدۆنیس بە ئاشکراو بە جورئەتەوە گوتی: بۆ ئەوەی کۆمەڵێکی پوختە و زیندو و دیمۆکراسی و پڕ لە عەدالەت دامەزرێنین، پێویستە کۆمەڵێك شت هەیە بیکەین وەك : دابڕاندنی دەستەلات لە تەواوی مەرجەعییەتی ئایینی، سوود وەرنەگرتنی سیاسییانە لە ئاین بە مەبەستی سیاسی و ناردنی کاریگەری بۆ سەر کۆمەلانی خەلك، جیاکردنەوەی ئەوەی ئایینییە لە ئەوەی سیاسییە، واتە دامەزراندنی دەستەلاتێکی مەدەنی هاوچەرخ، گشت ئازادییەکان بپارێزێ، بۆ هەموو کۆمەلانی خەلك، ئەمەش لە ڕێگای قانون لە بنچینەکانی دەولەت و هاوولاتی بوون و مافەکانیان و ئەرکەکانیان.

گوتی هەموو تێکستێك لە خۆیدا پڕە لە توندوتیژی، بە تایبەتیش تێکستی ئایینی، بۆیە جیاکردنەوەی ئایین لە دەولەت، ئایین لە سیاسەت دەپارێزێ و بە پێچەوانەشەوە. لە بارەی ژنانەوە گوتی زۆر بە سادەیی یەکەمین هەنگاوی ئازادی ژنان ئازادی ئابوورییانە، ژنان وەك پیاوان کار بکەن و چارەنووسیان لە دەستی خۆیان بێ، بەم چەشنە دەشێ یەکەمین هەنگاوی لە ناوبردنی توندوتیژی بەرامبەر بە ژنان لە ناوبرێ. لێرەوە سەرەتای چوون بەرەو پەیوەندییە کۆمەلایەتییە دروستەکان دەست پێ دەکا.

ئەدۆنیس بە ئاشکرا و بە جورئەتەوە گوتی، لەو زەمان و سەردەمە دوورەی سەرهەلدانی ئاین، هێشتا نە کێشەی ئیتنیکی، نە کێشەی ناسیۆنالیزم نەبوو، ئایینەکان وەك کودەتای سوپایی و ئیدیۆلۆژی یەك لە دوای یەك هاتن، بە تایبەتی ئایینە تەوحیدییەکان (مۆنۆتایستەکان)، هەمووشیان لە یەك کولتوور و سەرچاوەوە هاتوون و پشتیان بەیەکتر بەستووە، هەموو ئایینە وەحدانیەکان دەڵێن ئێمە دوائایینین، دوا پەیامبەرمان هێناوە. لە لای ئەدۆنیس فیکرەی خودا، فیکرەیەکی ئەبستراکتی دوور و کۆنە (فکرة تجریدیه بعیدە و قدیمە)، لە لای ئەدۆنیس ئەمڕۆ فیکرەی خودا چیتر سەنتەری گەردوون نیە، بەلکو مرۆڤ خۆی ئەم سەنتەرە داگیر دەکا. ئیتر لێرەوە وردبوونەوەی زیاتری دەوێ، بەو مانایەی کێشەیەك هەیە، بەلام ئەدۆنیس لە بارەی ئەم کێشەوە دەلێ (لە هەموو گۆڕانێك، ئەوەی دێ پێشکەوتنە بۆ ڕابردوو، بەلام دواکەوتوو و ڕەجعیە بۆ

ئاینده) یان بە مانایەکی تر دەشێ ببێتە دۆگما و بت، هەروەکو لە تاقیکردنــەوە ئاینییەکان ئەمە بەرچاو دەکەوێ. سەرەنجام بۆ دەرچوون لەم دۆگما و دەســتەلاتی بتە، پێویستە خوێندنەوەیەکی نوێ و ڕوشنبیرانەمان بۆ هەموو تێکستە کۆنەکان و کتێبە پیرۆزەکان هەبێ.

ئەدۆنیس، ئازادی مرۆڤــی موســلمان و ڕۆژهــەلاتی بــەراورد دەکــرد بــە هــی ڕۆژئاوا. ئەگــەر ئــازادی وەك مەســافەیەك پێناســە بکــەین لــە نێــوان مرۆڤــی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی، بە تایبەتی مرۆڤی موسلمان و مرۆڤی ڕۆژئاوا، دەبیــنین ڕۆژئاواییەکە ئاسۆی لە پێشدا کراوەتەوە، لە ناو ئازادییەکی ڕەها دەژیێ، هەرچی موسلمانەکەیە، فەزای ئازادییەکەی تەنیا یەك بستە. لێرەشەوە جیاوازییــەکانمان بۆ دەردەکەوێ، کە مرۆڤی موسلمان و ڕۆژهەلاتی، زنجیرێکی ئەســتوور و گرانــی ئایینی و ئیدیۆلۆژی لە ملی خۆی کردووە، ئەم زنجیرەش بە پلەی یەکەم لە لایــەن نوخبە ڕۆشنبیرەکان، لە ناو تەواوی کۆمەڵ و چین و توێژەکان رابەرایەتی دەکــرێ. بەلام دەپرسم بە راست، ئێمە ڕۆشنبیرانی پڕ لە کاریگــەر و پــڕ لــە هــەژموونمان هەیە لە ناو ئازادی بۆ ئازادی دروست بووبێ ؟! یان ئێمە ڕۆشنبیرێکمان هەیە لە چوارچێوەی ئیدیۆلۆژی خۆی مانۆڤەر دەکا ؟!

بێگومان مرۆڤی کورد، هەموو ئەم کێشانەی هەیە، لە ناو هــەمان پەیوەنــدی ئالۆزی کۆمەلایــەتی و سیاســی و ڕۆحــی و فەرهــەنگی دەژیــێ. بــەلام ئــەوەی ســەرسامی دەکردم و ئالۆزی بۆ دروست دەکردم، بۆچی کە ئەدۆنیس قسەی دەکرد ئەوان دووچاری شۆك و دلەڕاوکە دەبوون؟ ئایا شاعیرێك دەبێ بەم چەشــنە قســە بکا یان ئەمە کاری ئەو نیە ؟! بێگومان دەشێ و زۆر باشــیش دەشــێ شــاعیرێك بەم چەشنە قسە بکا. ئیتر کە کوردەکان ئەوها نین و بە هــەژموون نــین بــۆ ســەر کۆمەڵ و تاکی خۆیان دیارە کێشەیەك هەیە. بێگومــان کێــشەیەك هەیــە. ئــەم کێشەیەش بریتیە لە بچووکی و کەم فەرهەنگی خۆیان، سادەکاری و هــەرزەکاری لە بیرکردنەوە. نەبوونی زمــانێکی ڕوون، دیارنــەبوونی سەرچــاوەکانی فیکــری و خیتابی ئەوان، باوەڕنەبوون بە کارکردن و دلسۆزی بۆ فیکری خۆیان، هەمانە، لە ناو خیتابێکی پڕ لە تەم و مــژ بــە نــاوی فەلــسەفە و ئــازادی و جیهــانی نــوێ،

فیکرەیەکی بچووکی پڕ لە واهیمەی خۆی پیشان دەدا. هەمانە وەهەم بە ناو لاوان بلاّودەکاتەوە، بە ناوی ڕۆشنبیری دەیفرۆشێتەوە، ڕۆژێك بینیوتانە شێرکۆ بێکەس و هاوڕێکانی، (شاعیرانی گەورەی گەلەکەمان...؟؟!!) شاعیرانی پێشەوەی ئەمبەر و ئەوبەر، کۆمپرادۆرانی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی کوردی، بازرگانانی دەزگا و بلاّوکردنەوە، بتەکانی ئیدیۆلۆژی و پیاوانی بەیداخی زمانی گەل، هاتوون ڕۆژێك لە ڕۆژان باس لە شیعر بکەن بۆ نەوەی نویّ، نەك هەر ئەمە بەلّکو بۆ عامەتی خەلّك، بلّێن کوردینە بە بیرتان دەهێنینەوە، بە ڕاست شیعر واتە ئازادی و خۆشەویستی. هاتوون ڕۆژێك لە دەرەوەی هێلّی ئیدیۆلۆژی خۆیان و ناوچەپەرستی خۆیان، باسی ئەو کێشە جیهانیانە بکەن کە مرۆڤی کورد تێیدا دەژییّ، هاتوون ڕۆژێك ڕوانینی خۆیان لەمەڕ عەلمانیەت و دەستەلاّتی ئایینی پیشان بدەن. هاتوون ڕۆژێك باس لەو دیاردە نوێیە بکەن کە خەریکە وەهابیزم و سەلەفیزم مرۆڤی کورد دەکرۆژیّ، ئەو ئیسلامە سادەی وەك کولتوور لە باوك باپیرانیانەوە بۆیان مابووەوە خەریکە ئەویش لە ناو دەبن و بەرگێکی وەهابییانەی لەبەر دەکەن. هاتوون باس لە کێشەی ژنانی کورد بکەن، خۆ کێشەی ژنانی کورد، واتە کێشەی هەموو کورد ! هاتوون باس لە کوێرەوەری فەرهەنگی بکەن کە مرۆڤی کورد و لاوەکانی تێی کەوتوون...هتد.

سەرەنجام، بە پێچەوانەی بتەکان و ئیدیۆلۆژی پەرستەکان، دەروێشەکانی ئایینی نویّ، ئێمە دەمانەویّ کورد بین، دەمانەویّ مرۆڤ بین، ئازاد بین، ڕۆشنبین و سەر پڕ لە پرسیار بین، بە دوای عەدالەت و عەلەنخوازی دەگەڕێین، دژی هەموو ئیدیۆلۆژی و سیستەمێکین سنوور و کۆت و زنجیر بۆ ئینسانی کورد دابنیّ، لە ڕوانگەی ئێمە کوردبوون واتە ئازادبوون....هتد، بەلاّم دیارە شاعیران و نووسەرانی کورد دەمێکە لە بیریان کردووە شیعر واتە ئازادی، واتە خۆشەویستی، واتە مرۆڤبوون.

# شیعر یان وشە ریز کردن ؟!

ئەوەی دەمویست جارێکی دی پێداچوونەوە و دڵنیایی لەسەر بکەینەوە، ئەو گەڕەولاوژەیەیە کە لە شیعری کوردیدا هەستی پێدەکرێ، گەڕەلاوژەیەك کە ناتوانرێ پێناسە بکرێ، چونکە هیچ ئەدندازە و رێکخستن و روانگەیەکی ئەوتۆی تێدا نیە، یان هیچ چنینێکی ئێستێتیکی تێدا نیە و راتبگرێ و دووچاری هەڵوەستە و بیرکردنەوەت بکا. من ناو لەم گەڕەلاوژەیە دەنێم "وشەریزکردن"، وشەریزکردن دوور لە هەموو چنینێکی -Plot خەیاڵی و هونەرێکی زمانی. تەنیا پڕ کردنەوە ئاخنین و درێژدادڕی. لە تیۆری ئەدەبی نوێ بەمە دەگوترێ : تۆتۆلۆژی - Tautologi . ئەمە دەق هەڵکەوتی ئەمڕۆی شیعری کوردییە (هەڵبەت چەند شاعیرێك و هەندێ شیعری تاك و توکی نەبێ ئەم روانینە نایانگرێتەوە، بە پێچەوانەوە دیاردەیەکی گشتییە). لەوانەیە حەز بکەم هاوار بکەم و بڵێم خەڵکینە شیعر ئەوە نیە، بەڵام پێویست بە هاوارکردن ناکا، چونکە زوو ئەوە بە بیرخۆم دەهێنمەوە : دەمێکە ئەرستۆ باسی لەمە کردووە، هەموو شاعیرێك دەبێ ئەم روانینە بەڵگەنەویستە سادە و ساکارە بزانێ کە قووڵاییەکی زۆری هەیە، کە دەڵێ : "ئەوەی بە شیعر دەگوترێ بە فەلسەفە ناگوترێ !" کەواتە شیعر نووسین هەر تەنیا وشە ریزکردن نیە، دارشتنی خەیاڵێك بێ هیچ بنچینە و سترەکتورێکی خەیاڵی ، بێ هیچ ئامانجێکی خەیاڵی، بێ هیچ ئەندازەیەکی خەیاڵی. لەم وشە ریزکردنە مانا و روانین بزرە، پێکهاتەیەکی لۆژیکی و نالۆژیکی بوونی نیە، دەشێ بەم جۆرە لە پێناسە کردنی نزیك بینەوە. بە گشتی

ئەمەیە مەسەلەی سەرەکی ئەم گوتارە، وشە ریز کردن لە فۆرمی شیعر (یان شیعری وشە ریزکردن)، کە بۆتە دیاردەیەکی هاوچەرخ.

سەرەتا پێم گونجاوترە بنچینە و زەمینەی وشەریزکردن لە فۆرمی شیعری باس بکەم. وشەریزکردن لە چییەوە دێ ؟ چ خەسڵەت و هەڵکەوتێکی رۆشنبیری و هەڵکەوتێکی فەرهەنگی سۆسیۆلۆژی پیشان دەدا ؟ ئایا ئەوەی بە ناوی وشەریزکردنەوە وەك شیعر دەنووسرێ نموونەی لە ئەدەبیاتی تری جیهانی هەیە ؟

بە پلەی یەکەم وشەریزکردن "دوور لە چنینێکی ئەندازەیی سەنکرۆنیزی کە هەموو لایەنەکان لە رووی مانا و دارشتن و روانگەی ئێستێتیکی تێکبکاتەوە"، کە ئەمرۆ بۆتە دیاردەیەکی باو لە شیعری کوردی، پەیوەندی بە چەشە و زەوقێکی میللی رۆژهەڵاتیانەی سادە و ساکارەوە هەیە کە هێشتا سەدەیەك رووناکی دوورە لە گەیشتن بە فیکری موجەرەد، ئاستێکی بیرکردنەوەی سادە و ساکار کە زیاتر هەڵکەوتێکی فۆلکلۆریانەی هەیە. نەتوانینی کارکردن لە ئاستێکی خەیاڵی بەرز و ئەبستراکت، دروستکردنی جیهانێك کە مرۆڤ خۆی، ئایندەی خۆی، ئامانجی خۆی تێدا بدۆزێتەوە. لەمەشەوە لە رووی تەکنیکی واتە : نەبوونی شێواز، تێنەگەیشتن لە فۆرم و وێنەی خەیاڵی و مێتافۆر و رەمز و توانای شکاندنەوەی زمان بە مەبەستی دروستکردنی وێنەیەکی خەیاڵی ئاڵۆز، بەڵام پوخت و مانادار و ئەندازەیی و خاوەن سترەکتور، بە کورتی دروستکردنی چنینێکی ئێستێتیکی.

لە کۆمەڵگەی کوردی زۆرن ئەوانەی لە شار دەژین، بەڵام هەڵکەوتی بیرکردنەوەیان هی شار نشین و نیە و گۆرانی بەسەردا نەهاتووە. (لێرەش پرسیاری ئەوە قووت دەبێتەوە ئایا شارەکانی کورد تا چەند گەیشتوونەتە ئاستێکی شارستانی ئاڵۆز بەرهەمی فیکری و بەرهەمی ئێستێتیکی تێدا بەرهەم بهێنرێ) لە نووسینی ئەمانەی ئێستا کە وشەریزکردن بە شیعر پێشکەش دەکەن، هەست بە خێرایی و بیرکردنەوە و وێنەی شیعری شار ناکەین. لەو لاشەوە بۆ ئەوەی بە هەڵەدا نەچین، ناشێ ئەمە بە وێنەی شیعری گوندی بەراورد بکەین، چونکە وێنەی شیعری فۆلکلۆری تێکەڵ بە تەم و مژ و بینای خەیاڵی و هونەری شێواز و

ئاڵۆزی لە دەربڕیندا نیە. شیعری گوندی، یـان شـیعرێك لـە ناوەنـدێکی گونـدی بەرهەم هاتبێ، زوو دەناسرێتەوە، هەڵبەت ئەمە هیچ کێشەیەکی ئەوتۆ دروسـت ناکا، بە قەد ئەوەی کە کێشە و ئاڵۆزی دروست دەکا، ئەو بەرهەمەیە کە لە شار بەرهەم دەهێنرێ و سەر بە خەیاڵ و سترەکتوری شـیعری و بیرکردنـەوەی شـاریی نیە. چونکە زۆر بە سادەیی شار واتـە مـۆدێرنیزم، واتـە شـیعر وەك هونـەرێکی سەخت و بینایەکی سەخت، دروستکردنی جیهـانێکی ئێـستێتیکی و چـنینێکی هونـەری کـە مانـدووبوون و خـەباتێکی زۆری دەوێ، ئەمـەش بـە پێـچەوانەی وشەریزکردنە، کە لە شەو و رۆژێکدا دەنووسرێ.

بنچینەی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی وشەریزکردن واتە گەرەلاوژەی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی، هەموو ئەوانەی وشە ریز دەکەن لە ناو پێکهاتەیەکی کۆمەڵایـەتی ئایینی ترادیسیۆنالیست و فەرهەنگی بـاو و زاڵ دەرهـاتوون، (مەبەسـت لەمـە تاکەکەس بزرە، تاکەکەس وەك گشت بیردەکاتەوە)، ئەمانە هـەموویان سـەر بـە خێزانی ترادیسیۆنایستی گەورەن (گەورە لە رووی ژمارەوە نـەك لـە رووی پایـەی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی) کە فرسەت بۆ هیچ یەکێکیان هەڵنەکـەوتووە بـچێتە قۆناغێکی بالاتری فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی، چونکە زۆر بە سادەیی کە شیعرێك دەبینین دوورە لە وشە ریز کردن، سەنکرۆنیزێکی ئەدەبی (یان خـەیاڵی) لـە رووی مانا و روانین تێدا دەدۆزینەوە، واتە ئەم شیعرە هی یەکێکە چەند هـەنگاوێك لـە گەرەلاوژەی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی دور کەوتۆتەوە، واتـە تاکـە کەسـێکە لـە هونەرەکانی دارشتن لە سەر ئاستی خەیاڵ و زمان شارەزایە، دەتوانێ ئاڵۆزییـەکی مـەفهوم دروسـت، بکـاو سـادەییەکی قـووڵ بنیـات بنـێ. ئەمـەش واتـە ئیندیڤیدوالیزم (الفردیه) بە مانا فکرییەکەی، هەڵبەت ئیندیڤیدوالیزمێکی پڕ لە رۆشنایی، یان رۆشنبیر، چونکە ئیندیڤیـدوالیزم ئـەو سـەری بـالای کۆمەڵگـەی ترادیسیۆنالیستە. لە کۆمەڵگەی ترادیسیۆنال (تقلیدی) شیعری میللی لە فۆرمی (نوێ و زمانی نوێ و بزربوونی چنین) هەیە، چونکە زۆر بە سادەیی بیرکردنـەوەی میللیانە و خەیاڵی میللیانە هەیە، بەلام لە کۆمەڵگەی ئیندیڤیـدوالیزم شـیعری مۆدێرن هەیـە، دەشـێ شـیعری مـۆدێرنی میللیانـەش هـەبێ، بـەلام خـەیاڵ و

بیرکردنەوەی میللیانە لە ناو جیهانی خۆی خۆی قەتیس کردووە و چیتر کاریگەری نیە.

من لەو باوەڕەدام، هۆکاری ئەم وشە ریزکردنەی ناو ئەدەبیاتی کوردی، بە پلەی یەکەم بگەڕێتەوە بۆ ناکۆکی و دووبەرکی ئەم دوو جیهانە، کۆمەڵگەی ترادیسیۆنال و کۆمەلگەی ئیندیڤیدوالیزم، ئەمەش واتە دوو جۆر بیرکردنەوەی زۆر جیاواز و لێك دوور، دوو روانگەی زۆر جیاواز و نامۆ بە یەکتر، دوو زەوق و چەشەی جیاواز، هەڵبەت کۆمەڵگەی ئیندیڤیدوالیزم باڵاترە لە کۆمەڵگەی ترادیسیۆنال. لە ناو ئەدەبیاتی ئەم دوو کۆمەڵگەیە فۆڕمەکان، شێواز و روانگە و زمان بە دوو ئاستی بیرکردنەوە و خەیاڵی جیاواز سوودی لێ وەردەگیرێ، شاعیری کۆمەلگەی ترادیسیۆنال وشە ریز دەکا، کار لە ناو خەیاڵ و زمان ناکا، بە پێچەوانەوە شاعیری سەر بە کۆمەلگەی ئیندیڤیدوالیزم سترەکتورێکی بۆ خەیاڵ و مانا و چنین دادەنێ، وشە لە پێناوی وشە ریز ناکا، جیهانێك دروست ناکا بریتی بێ لە وەسفێکی فلات و رووکەش، مەسەلەکە هەر تەنیا گوتنی وشەی جوان نیە، داڕشتنی وێنەی جوان نیە، بەڵکو ئەدەب و هونەر بریتییە لە پیشەسازییەکی ناوێزە و سەخت و تاقەت پڕوکێن.

بەلاّم ئەمڕۆ کۆمەڵگەی کورد لە ناو وەرچەرخانێك لە نێوان ئەم دوو پێکهاتە و خەسڵەتە دەژی، واتە لە سەردەمی گواستنەوە لە کۆمەڵگەی ترادیسیۆنال بۆ کۆمەلگەی ئیندیڤیدوالیزم، ئەو کێشەیەی کە لە شیعری کوردی دەدۆزرێتەوە کە ئێمە پێی دەڵێین وشە ریز کردن، بزربوونی مانا، نەبوونی بیرکردنەوە، کرچ و کاڵی زمانی خەیاڵی شیعری، بە یەکچوونی Typique گشت خەیاڵەکان و گشت وێنە و شێوازەکان، هەمان شت لە بوارەکانی تری هەڵکەوتی کۆمەلاّیەتی هەستی پێدەکرێ، زانکۆ و دەزگا کولتوورییەکان، وەزارەت و حکومەت و گشت کەسەکان، لە نێوان ئەم دووبەرەکییە دەژین، لە لایەك کۆمەڵگەی ترادیسیۆنال کە خەسڵەتە سەرەکییەکانی بریتییە لە بیرکردنەوەی میللیانە و بوونی کاریگەری نایین تا رادەی گەیشتن و گۆشکردنی تاکەکان بە ئەفسانەو فکری پڕوپوچ و نەتوانینی چوون بەرەو جیهانێکی تر، جیهانێکی باڵاتری بیرکردنەوە و بەرهەم

هێنان، لەولاتریشەوە، کۆمەڵگەی ئیندیڤیدوالیزم پەڵکێشی کۆمەڵگە دەکا بەرە و جیهانێکی مۆدێرن و عەلمانی و هەمەجۆر بەرهەم و هەمەجۆر بیرکردنەوە و هەمەجۆری شێوازی هونەری، هێشتا بچم و روخسارە زۆرەکانی، بچم و روخسارە نوێیەکانی بە تەواوی دەرنەکەوتوونە. ئیتر لە بواری شیعر، کە سەرنج دەدەین، لە ناو ئەم پێکهاتەیە، مانا بزرە، چنین بزرە، شێواز بزرە، تاکەکەس بزرە، خەیاڵ بزرە، بە گشتی بیرکردنەوە بزرە، بەڵکو ئەوەی کرچ و کاڵە بە ناوی نوێ و نوێخوازی و تازەگەری و رەوتی نوێ دەفرۆشرێ، چونکە بەرهەم هێنانی شیعر، بە پلەی یەکەم پەیوەندی بە بیرکردنەوەوە هەیە، (لە کۆمەڵگەی ئیندیڤیدوالیزم بیرکرنەوە هەیە، بەڵام لە هی ترادیسیۆنال بیرکردنەوە نیە، بەڵکو سەلیقە هەیە، شیعری کۆمەڵگەی ترادیسیۆنال بە سەلیقە دەنوسرێ، ئەمەش واتە وشە ریز کرن نەك بیناکردنی خەیاڵ و جیهانێك لە ناو زمان) ئەمەش تەواو لەگەڵ ئەو روانینەی دەمێکە ئەرستۆ گوتویەتی تێدکدەکاتەوە کە دەڵێ : ئەودی بە شیعر دەگوترێ بە فەلسەفە ناگوترێ، کەواتە شیعر بەرهەم هێنان (نەك وشە ریز کردن) بیرکردنەوەیەکی ئاست بەرزتری دەوێ لە چاو دروستکردنی خیتابێکی فەلسەفی.

لە ئەدەبیاتی جیهانی، بە تایبەتی لە ئەدەبی فرەنسی کە من زۆرتر لێی شارەزام، تا ئێستا دیاردەی لەم جۆرەم نەبینیوە وشە ریز بکرێ و وەك شیعری نوێ و هاوچەرخ پیشان بدرێ، هەڵبەت شاعیری پلە دوو و سێ و چوار زۆرن....، بەڵام ئەوەی کە سەرەنجراکێشترە زۆر بە سەختی دەچنە ناو بڵاوکراوە ئەدەبیەکان. رەنگە لێرەوە پرسیاری ئەوە بکرێ : باشە خۆ شیعری سوریالی وشە ریز کردنی تێدایە، ئەمەیان چی ؟ نەخێر شیعری سوریالی ئەگەرچی لە مێژووی ئەدەبی جیهانی بە گشتی و ئەدەبی فرەنسی بە تایبەتی بە لاوازترین شیعر لە قەڵەم دەدرێ، وشە ریز کردنی تێدا نیە، بەڵکو چنینێکی خەیاڵی و کارکردن لە ناو مانا و شێوازی نوێی تێدایە، جۆرێکە لە فەوزایەکی رێکخراو. بە پێچەوانەوە لە وشە ریز کردنە کوردییەکان، لە ناو فەوزای شیعری کوردی رێکخستن بوونی نیە، ئەگەرچی زۆریش دوورە لە تایبەتمەندی لۆژیکی سوریالی.

له کۆمەڵگەی فرەنسی، بە تایبەتی و لە کۆمەڵگەی رۆژئاوا بە گشتی، شیعر سەختترین فۆرمێکە یەکێك بتوانێ تێیدا جیهانێکی کامڵ و ناوازەی ئێستێتیکی و ژیاری لێ دروست بکا. بێگومان ئەم جۆرە روانینە تەنیا لە کۆمەڵگەی تاکەکەسی "ئیندیڤیدوالیزم" دا هەیە کە زۆر دوور کەوتۆتەوە لە کۆمەڵگەی ترادیسیۆنال، هەڵبەت هۆکارەکانی پشت ئەم گەشە سەندنە شارستانیەی رۆژئاوا دیارن و پێویست بەوە ناکا لێرەوە لەم گوتارە بچوکە پێدابچینەوە، ئەوەی کە زۆر گرینگە جارێکی تر بیخەینەوە ژێر پرسیار، مەسەلەی ریزکردنی وشەیە کە بە شیعر بەرهەم دەهێنرێ و پێشکەش بە خوێنەر دەکرێ، کە "منی خوێنەر" وەك چۆن رۆلان بارت دەڵێ: خوێندنەوە بریتییە لە لە دایکبوونی خوێنەر و پاشەکشەی نووسەر یان شاعیر (بنووس) بۆ چەند ئاستێکی تری خوارەوە ( کە هەندێ جاریش دەگوترێ لەو چرکەیەی خوێندنەوە دەست پێ دەکا نووسەر دەمرێ خوێنەر لە دایك دەبێ) کە خۆم بەرامبەر بەم هەموو شیعرە زۆرە دەبینمەوە لە ناو رۆشنبیری کوردی (بلاوکراوە نەدەبییەکان) نەك هەر لە دایك نابم، بەڵکو ئاوارە و سەر لێ شێواو و قوربەسەر خۆم دەدۆزمەوە، چونکە بە دوای جیهانێك دەگەرێم نایدۆزمەوە، بە دوای فۆرمولەیەکی شیعری دەگەرێم نایدۆزمەوە، بە دوای چنین و مانایەك دەگەرێم نایدۆزمەوە، تەنیا وشە ریز کردن دەدۆزمەوە، وشە ریزکردنێك زیاتر وەك لاپەرەیەکی قاموس دەبینرێ وەك لە قەسیدەیەك وەك لە بەرهەم هێنانێکی ئەدەبی.

وشە ریزکردن واتە بە یەکچوونی هەموو شیعرەکان، هەموو بیرکردنەوەکان، هەموو بەرهەم هێنانە ئەدەبییەکان.

# مرۆڤە تاریکەکان

ئێلیتی (هەڵبژاردە، چین، توێژ، دەستەبژێر) ڕۆشنبیرانمان، واتە هی کورد، توێژێکی سەر لێ شێواون، توێژێکن کە دەبێ بە پێی لێکدانەوەی تیۆری ئەم دیاردەیە، سەر بە ڕوانینێکی پوخت و شێوازێکی پوختی فۆرمولەکردنی شتەکان و دیاردەکان و کێشەکان بن، دووربن لە هەژاری مێشك و هەژاری لە بیرکردنەوە، واتە، ئەوان دەبێ وەك چرایەك بن لە ناو تاریکی، ، دەتوانین ناو لەم توێژە بنێین مرۆڤە ڕۆشنەکان. بەلاَم کە سەرەنج دەدەین، هەڵبەت لە گۆشەنیگای ژیان و واقیعی ئەمڕۆی مرۆڤی کورد، زیاتر سیفەتی مرۆڤە تاریکەکان وەردەگرن، چونکە ئەوان بە چەشنێکی دیکە تاریکی بە ناوی ڕۆشنایی بەرهەم دەهێننەوە.

مەسەلەی سەرەکی ئەم بابەتە ئەوەیە: توێژی ڕۆشنبیرانمان بۆ خۆیان نین و بۆ بیر لە کەسایەتی و کێشەکانی کورد ناکەنەوە، بۆ هەوڵنادەن کێشەکانی مرۆڤی کورد لە هەموو بوارێکەوە بکەنە کێشەیەکی جیهانی، هەڵبەت جیهانی بە مانای کێشەی سەرەکی بیرکردنەوەی تیۆری و پراتیکی خۆیان؟ ئایا ئێمە بێ کێشەین؟ ئایا ئێمە کۆمەڵ نین؟

ئایا پەیوەندییەکان: لە ڕووی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ڕۆشنبیری، ئابووری، ...هتد، لە ناو کورد نیە؟

یان مەسەلەکە ئەوەیە ئەم بوارانەیان پێ بێ بایەخە؟ یانیش مەسەلەکە ئەوەیە پێیان وایە مرۆڤی کورد ئازاری نیە و بێ ڕوانینی واقیعی و بیرکردنەوەی دروستە؟ یان ئەوەی مرۆڤی کورد بەرهەمی دێنێ نرخی نیە و چروکە؟

مەسەلەی سەرەکی بریتیە لە کەسایەتی، ئێمە چۆن خۆمان بناسین، چۆن ئەویتر بناسین، چۆن لە کێشەکانی خۆمان ڕانەکەین. چۆن وەك کورد خۆمان بکەینە سەنتەری گەردوون و جیهان؟ لە هەر بوارێك دەیگری: سیاسی،

کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، ئابووری ...هتد، ئێمە کۆمەڵێك کێشە و گرفتمان هەیە، بەڵام نوخبەی ڕۆشنبیرانمان ئەم کێشانە ناکەنە کەرستەی بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە و بە دواگەڕانی خۆیان، لێرەش مەبەستم لە ڕۆشنبیران هەر تەنیا نووسەران و شاعیران و گوتارنووسەکان نیە، بەڵکو هەموو ئەوانەی هوشیارن و بیردەکردنەوە، ئینجا بە تایبەتی ئەوانەی بەرایی، ئیمرۆ، لە ناو ئەم توێژە، هەڵکەوتێکی زاتی و ناچیزە و بێ مانا هەیە، هەتا بۆ نووسەرەکانیش، بۆ شاعیر و ڕەخنەگرەکانیش کێشەکانمان نەبوونەتە کەرستەی سوود لێ وەرگرتن.

یەکێ لەو مۆدە چروکانە، لە لای ڕەخنەگرێکی کورد میشێل فوکۆ و ژاك دێریدا و هابرماس-ێك لە پێشترن لە نووسەرانی داهێنەری کورد، ئەمەش لە کاتێکدا میشێل فوکۆ و دێریدا و هابرماس هەر ئەمرۆ لە ڕۆژئاوا لە چەند کەسێك زیاتر نایان خوێننەوە، بەڵام لە کوردستان لەسەر زارانە، ئەمانە بێگومان بەختەوەرن کە کورد بیریان لێ دەکاتەوە، لەگەڵ ئەو ڕایە بێ مانایەشدا نیم بڵێم فوکۆ و دێریدا و هابرماس پەیوەندی بە کوردەوە نیە، یان سوودی بۆ کورد نیە، نەخێر، بەڵکو ئەوەی بە لامەوە گرینگە و ئارەزوو دەکەم ئەوەیە، کورد بۆ خۆی فوکۆ و دێریدا و هابرماس-ێکی هەبێ، چونکە مرۆڤی ڕۆژئاوایی، فرەنسی و ئینگلیزی و ئەلمانی ...هتد، بە هەموو کێشە و ناتەواوی و ئازار و ڕوانینەکانیان بوونەتە کەرستەی یەکەمی فوکۆ و دێریدا و هابرماس، ئەوان باس لە مرۆڤی ڕۆژئاوایی دەکەن، ئەوان باس لە خۆیان دەکەن، خۆیان بە هەموو جیاوازی و خاسییەت و کەسایەتی تایبەتی خۆیان، وەك مرۆڤ، وەك بوون، وەك ڕوانین، ئەمەش سەرەڕای بوونی کەمێك پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تری غەیرە ڕۆژئاوایی، شارستانیەکە زۆر جیاوازە لە ئێمە، مەسەلەی سەرەکی لەم جیاوازییە ڕوانین و شێوازە، ڕوانین و شێوازی ئێمەش سەرەڕای کوێرەوەری خۆمان لە ڕووی کولتووری لە هی ئەوان جیاوازە، سەرەنجام ئەوان بەم ڕوانین و شێوازە باس لە کەسایەتی و کێشەی خۆیان دەکەن، لێی هەڵنایەن، ڕووبەڕووی دەبنەوە، دەیکەنە سەنتەری بیرکردنەوە و وجودی خۆیان، ئینجا گرفتەکان لێرەوە سەرهەڵدەدەن، ئێمە سەرەڕای جیاوازیمان، سەرەڕای جیاوازی ڕوانین و شێواز، لە کێشە و واقیع و بوونی خۆمان هەڵدێین، یانیش دەمانەوێ بە ڕوانین و شێوازی ئەوان لە خۆمان

بگەین، مەسەلەی سەرەکی ئەمەیە، ئێمە باسی خۆمان ناکەین، خۆمان فەرامۆش دەکەین، فەرامۆش کردنێکی شارستانی، ئەمەیە سەر لێ شێوانەکە. لەم هاوکێشەیە کە نووسراوەکانی (بەرهەمی ئەدەبی و فکری و ...هتد) گوایە مرۆڤە ڕۆشنەکانی خۆمان دەخوێنینەوە لە گەرەلاوژە و شتێکی بێ مانا زیاتر نیە، دارشتنێکە هێشتا هەر لە دایك نەبووە مردووە، چونکە لەم سەر دەچین بۆ ئەم سەر تێی ناگەین، بێگومان گرفتەکە دەزانرێ لە کوێیە، بۆ هەموو کەسێك ڕۆشن و دیارە. گرفتەکە گرفتی خۆنەناسینە، ئەمەش کێشەیەکی فەلسەفییە، کێشەیەکە دەشێ هەموو بوون و واقیع و ڕوانینی ئێمەی پێ بخوێندرێتەوە، بێگومان ئێمە دەتوانین سوود لە ڕۆژئاوا وەرگرین، هەڵبەت وەك مێتۆد، وەك شێوازی بیرکردنەوە، وەك تیۆر، نەك وەك کەرستە و بابەت و پەیوەندی ماددی. چونکە جیهانی ئەوان جیایە لە جیهانی ئێمە. هەر دیاردەیەکی ناو کۆمەڵی کورد دەیگری، بۆ نموونە وەك ئەو توند و تیژییەی بەرانبەر بە ژن و منداڵ و پیر دەکرێ لە کۆمەڵی ئێمە، کە بە ڕای من توندوتیژییەکی زۆر ترسناك و چارەنووس سازە، کاریگەری خراپی درێژخایەنی دەبێ لە سەر دروستی کۆمەڵی کورد، دەبێ بە پلەی یەکەم ببێتە کەرستەی مرۆڤە ڕۆشنەکانمان، ببێتە سەنتەری بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە، بەلام مرۆڤە ڕۆشنەکانمان لێی هەڵدێن، ڕووبەڕووی نابنەوە، بە لایانەوە گرینگ نیە، بە لایانەوە ئەو تێکستانە گرینگن کە فوکۆ و دێریدا و هابرماس لە بارەی ئەو توندوتیژیانە نووسیویانە کە لە کۆمەڵی ڕۆژئاوا دەرهەق بە ژن و منداڵ و پیرەکان کراوە، ڕاستە جارێکی دیکەش دەڵێم، ئەوانەی ئەمان دەشێ سوودی هەبی بۆ ئێمە، بەلام تەنیا وەك ئامێر و تیۆر و چۆنیەتی بیرکردنەوە، نەك وەك خودی کەرستەکە، ئێمە دەبێ خۆمان، بە ڕوانینی خۆمان وێڕای ئیمان و باوەڕهێنان بەم قەدەرە کە لە بنەڕەتی خۆناسیندا هەیە لە خۆمان وردبینەوە، وردبوونەوەیەك هاوتای وردبوونەوەی ئەوان بێ، ئەگەر لە هی ئەوان بالاتر نەبێ، کەمتر نەبێ، دواجار، مرۆڤە ڕۆشنەکانمان، بۆ گەیشتن بەم ئاستە، وەك ئەرکێکە لە سەریان دوژمنایەتی کوێرەوەری و هەژاری مێشك بکەن، ئەمەیە مەسەلەی سەرەکی، چونکە، خۆنەناسین دیاردەیەکە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کوێرەوەری بیرکردنەوەوە هەیە.

# مرۆڤێکی تر

مەسەلەی سەرەکی نەبوونی ڕوانین و خوێندنەوە یان بە گشتی زەمینەیەکی تیۆرییە. ئەمەش بە لای ئەوەمان دەباتەوە کە ئێمە لەمەڕ سەرنجدان و تێگەیشتنمان بۆ کێشەکان نوێین. نوێین نەك بە مانای تازە و تازەگەری، بەڵکو بە مانای کەم ئەزموونی و مانەوە و باڵادەستی داب و نەریتی کۆن، ئەمەش لێکدانەوەیەکی ئاڵۆز هەڵدەگرێ، کۆمەڵێك فاکتەر هەن کە ڕۆڵیان هەیە لە مانەوە و نەگۆڕانی ئێمە و نەبوونی ئەو زەمینە تیۆرییە. چونکە بوونی زەمینەی تیۆری لە تێگەیشتن و خوێندنەوەی کێشەکان، کێشە سیاسی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و ئابووری...هتد، یارمەتیمان دەدا باشتر لە کێشەکان بگەین، دواتر ئاسانتر چارەسەریان بکەین، لە هەمان کات یارمەتیمان دەدا ببینە خاوەن شێوازێکی تایبەت بە خۆمان لەمەڕ تێگەیشتن و چارەسەرکردن. چونکە هەموو کێشەیەك لە هەر سەردەمێك هەلکەوتێکی دیاریکراوی هەیە و بە زۆر شێوە خۆی نیشان دەدا، لەگەڵ یەکەم سەرنجدان ئاڵۆز و خەست دێتە بەرچاو، بەڵام بە بوونی زەمینەیەکی تیۆری و شێوازێکی گونجاو دەشێ زۆر شت بە ئاسانی چارسەربن.

ئینجا ئەو فاکتەرانە چین کە ڕۆڵیان هەیە لە هەلکەوتی ئێمە لە نەبوونی زەمینەی تیۆری و شێواز ؟ دەشێ بڵێین تازەیی ئێمە وەك کورد لە ناو پەیوەندییە جیهانییەکان، باڵادەستی کولتور و دابونەریتی کۆن، کۆن بە مانا نێگەتیڤەکەی، چونکە ئێمە کۆمەڵێك دابونەریتی کۆنمان هەن مەرج نیە نێگەتیف بن، بەڵکو لەبەر ئەوەی پۆزەتیڤن درێژە بە خۆیان دەدەن. هەلکەوتی ژیۆپۆلیتیکی کوردستان، کە ئەمەیان وەك مانەوە و قەتیسبوونی شارستانی دێتە بەرچاو وا

دەكا مرۆڤی كورد نەگۆڕێ، یان لە جێگـای خـۆی بمێنێتـەوە، یـان بـە زەحمـەت هەنگاو بۆ پێشەوە بنێ.

بـوونی ڕوانینـی تیـۆری لەمـەڕ تێگەیـشتن پەیوەنـدی بـە مـۆدێرن و مۆدێرنیزاسـیۆنەوە هەیـە، واتـە پەیوەنـدی بـە نـوێ و نوێبوونـەوە، تـازە و تازەگەرییەوە هەیە. لەم هەڵكەوتە تازەیە هەست دەكەین مرۆڤی كورد ئازارێكی زۆر دەكێشی لە دەربڕین و تێگەیـشتن. ئەمـەش كێـشەیەكی شارسـتانیە، واتـە كێـشەیەكە كۆمـەڵێك سـەر و سـەودای كۆمەڵایـەتی و سیاسـی و فەرهەنگی ...هتد، هەیە. هۆكارەكـان ئـەوەن هەنـدێكی پەیوەنـدی بـە خـودی مرۆڤی كوردەوە هەیە، هەندێكی دیكەی پەیوەندی بە فاكتـەرە دەرەكییەكانـەوە هەیە. بەڵام ئەوەی بە لای منەوە گرینگ بێ و بایـەخی پـێ بـدەم، ئـەو روحـە شارستانیە رۆژهەڵاتیەیە كە زۆر بە زەحمـەت دەگـۆڕێ، زۆر بـە زەحمـەت بـەرەو نوێبوونەوە دەچێ، هەر لەبەر ئەمەشە دەبینین، هـەتا فۆڕمـەكانی دەسـتەڵاتیش وەك دەوڵەتەكان حكومەتەكان لـە نوێبوونـەوە دەترسـن، نوێبوونـەوە دەیانخاتـە بەردەم هەقیقەتی خۆیان. لەم ڕوانگەوە كە سەرەنجی كۆمـەڵی خۆمـان دەدەم بـە هەمان شـێوە جۆرێـك لـە تەمبـەڵی شارسـتانی دەبیـنم كـە وەك دیاردەیـەكی كۆمەڵایەتی كەوناراو خاوەن مێژوویەكی دوور و درێژ دێتە بەرچاوم. بـە كـورتی واتە كۆمەڵگـەی ئێمـە هێـشتا نەبۆتـە كۆمەڵگەیـەكی دینامیـك و بزوێنـەر. كۆمەڵێكین زیاتر ئارەزوومان لە نەجوولانەوە و چوونەوە ناوخۆ هەیە، كۆمەڵێكی شەرمنین، كۆمەڵێكین لە نوێ و تازە دەترسـین، لـە هـەمان كـات خۆپەرسـتین و خۆمان خۆشدەوێ، خۆپەرستی واتە فەردییەتێكی نێگەتیف، نەك فەردییـەتێكی پۆزەتیف. فەردییەتی پۆزەتیف هەڵكەوتێكی كۆمەڵایەتی شارستانی و سیاسییە، واتە مرۆڤێكی رۆشنبیری خاوەن فشار و كاریگەری، ئەو مرۆڤەی دەتوانێ ببێتـە ماتۆڕێكی كۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشـنبیری پـۆزەتیف، دەتـوانێ ناوەنـدێكی كۆمەڵایەتی یان هەڵكەوتێكی شارستانی تازە دروست بكا و درێژەی پێ بدا.

ئەم فەردییەتە لە كۆمەڵی ئێمە زۆر لاوازە، ڕەنگە هەر نەبێ، دەتـوانین ئـەم دیاردەیە راستەوخۆ بە سەرنجدانی زمانی رۆشنبیری كوردی هەسـت پـێ بكـەین،

ئەگەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان و گۆڤارەکانی نووسراو و نەنووسراو سەیربکەین، ڕاستەوخۆ هەست بە زمانێکی سەقەت و نیگایەکی سەقەت دەکەین، زمانێك لە ئاست پرۆتێستۆ نەك لە ئاست تێگەیشتن و تیۆر. ئەمەش دەمانگەڕێنێتەوە بۆ مەسەلەی دەربڕین و تێگەیشتنەکە، لاوازی بیرکردنەوە و بۆچوون، بە کورتی ڕوانینی تیۆری. ئەم دیادەیە هەر ئەمڕۆ لە لێکدانەوەی شیعرێکەوە بگرە تا دەگاتە لێکدانەوەی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، بە زمانێکی دوور لە بوونی ئەم زەمینە و تێگەیشتنە تەعبیری لێ دەکرێ، زیاتر بە زمانێکی بازاڕی (بێگومان هەندێ نموونەی ناوێزە و جوانیش هەیە) ڕەخنەگرێك دەبێ زمانەکەی جیاواز بێ لە دوکاندارێك، ڕۆژنامەنووسێك بە هەمان شێوە ...هتد.

لێرەوە ناچارین بگەڕێینەوە بۆ کرۆکی مەبەست، ئایا مەسەلەکە چییە؟ خەوشەکە لە کوێیە؟ ئایا مەسەلەکە پەیوەندی بە ئیرادەی سیاسی دەسەڵاتی کوردییەوە هەیە کار لە سەر نوێبوونە و بە هاوچەرخکردنی زمان و فەرهەنگی کوردی ناکا ؟ یان مەسەلەکە بە گشتی پەیوەندی بە هەلکەوتی شارستانی ئەمڕۆی کوردەوە هەیە، تێگەیشتنێکی تیۆری وێڕای شێوازێکی گونجاوی نیە بۆ کێشەکانی خۆی، یاریدەی بدا لە قەیرانەکانی دەربێنێ، دوایی هەر ئەمەش ئەوەمان پێنالێ ئێمە، وەك کۆمەڵگا، وەك ئیرادەی سیاسی قەیرانەکانی خۆمان ناناسین، یان هەوڵ نادەین لە قەیرانەکان بگەین، یان هەوڵ دەدەین لێیان هەڵبێین. بە گشتی دەسەڵاتی کوردی، ناوەندی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی ئێمە نابێ لە نوێبوونەوە و تازەگەری بترسێ، بەڵام ئەمە پێویستی بە کولتورێکی تیۆری فراوان و گونجاو هەیە، پێویستیمان بە هێزو دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ماددی هەیە بۆ ئەوەی دینامیکی بخرێتە ناو کۆمەڵ، ناو تاکەکان، بە گشتی ئێمە نابێ بترسین لە نوێبوونەوە، لە شکاندنی بتکان، دۆگماکان، دۆگمانێگەتیڤەکان، هەموو ئەمانە بۆ مرۆڤێکی دیکەی نوێی خاوەن دەربڕین و شێواز پێویستە.

# شیزۆفرینیای تورکایەتی

... لێرەوە من باس لە پەیوەندییەکانی ئەم دواییەی نێوان تورکیا و هەرێمی کوردستان ناکەم، کە لە هاوینی ئەم ساڵ (٢٠٠٧) شەپۆلێك خۆپیشاندانی لێ کەوتەوە، ئەوەی بە لامەوە گرینگە بایەخی پێ بدەم ئەو هەستە ناسیۆنالیزمە کوێرانە و بکوژەی تورکەکانە کە دەمەوێ بە خوێنەرانی خۆمانی بناسێنم. هاوینی ئەم ساڵ بەختی ئەوەم هەبوو لە سەروبەندی خۆپیشاندانە گەورەکان لە شاری ئەنقەرە بم کە زیاتر لە هەفتەیەکی خایاند.

هەموو کەس دەزانێ شاری ئەنقەرە پایتەختی کەمالیزم و ناسیۆنالیزمی تورکییە، بەو مانایەی لەگەڵ دامەزراندنی تورکیای نوێ لە ساڵی ١٩٢٣ ، مستەفا کەمال پاشا، وەك کۆتایی هێنان بە سەردەمی عوسمانی و کولتور و ناسنامەی سیاسی عوسمانیزم، پایتەختی تورکیای نوێی بردە ئەنقەرە، ئەمەش وەك دابڕانێکی سیاسی و ئیدیۆلۆژی بوو لەگەڵ سەردەمی نوێ و تۆی چوون بەرەو ئایندەی هەڵگرتبوو. ئەگینا شارێکی وەك ئەنقەرە لە چاو ئەستەنبۆل لە کوێرە دێیەك زیاتر نیە و ئەمڕۆشی لەگەڵدابێ ئەو پایە کولتورییەی ئەستەنبۆلی نیە کە شارێکی کەنارای خۆرهەڵاتە و میترۆپۆلێکە لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا. هەرچی ئەنقەرەیە شارێکی عەسکەرتاری و تۆتالیتارییە، شارێکی ئیدیۆلۆژییە، بە کورتی شاری کەمالیزمە، لانکەی دەستەڵاتی سوپاو ئیدیۆلۆژی کەمالیزم و بگرە تۆرانیزمیش. باس لە دیمۆکراسی و پایتەختی نوێی تورکیا دەکرێ، لە ڕاستیدا ئەمە لە ئاوەژوو کردنەوەی شتەکان و فێڵ لە خەڵك کردن شتێکی دیکە زیاتر نیە، دیمۆکراسی پێش ئەوەی دامەزراوەی حکومی و ڕێکخراوی مەدەنی و پەرلەمان و پلورالیزم بێ، کولتور و ئەخلاقە، هەندێ پرەنسیپی شارستانی و

مرۆیی و جیهانین. پرەنسیپێکی دیمۆکراسی هەیە دەڵێ لە هەر کوێیەك، لە هەر دەوڵەتێك نەتەوەی دووەم (بە ژمارە) لەو شوێنە، لەو دەوڵەتە ئاسوودە و بووژاوەبوون، بزانە لەو شوێنە دیمۆکراسی هەیە. کوردستانی خۆمان سەرەڕای تەمەنی کورتی خۆی لە ڕووی حوکم کردن، لە چاو تورکیای نوێی ٨٥ ساڵە زیاتر ئامادەیە ببێتە هەرێمێکی دیمۆکراسی و خاوەن سیتەمێکی مرۆییانەتر.

ڕاستە دەڵێن لە دەوڵەتی دیمۆکراسی دەبێ پلورالیزم (تعددی حزبی) هەبێ و لیبرالیزمێکی کۆنترۆلکراویش بە دەزگاکانی دەوڵەتی دیمۆکراسی هەبێ، بەلاّم لە تورکیا هەموو ئەمانە بە ڕواڵەت هەیە، پلورالیزم هەیە بەلاّم پلورالیزمێکی شۆڤێنییە، لیبرالیزم هەیە، بەلاّم لیبرالیزمێکی تورکانەی شۆڤێنییە، نوخبەی ناسیۆنالیستی تورکی، ئەگەر ئیسلامی بێ یان عەلمانی هەموویان وەکو یەك بیر دەکەنەوە، فەلسەفەی ئەویتر و ئەویدیکە لە فکری سیاسی تورکی بوونی نیە، ئەوان ئەویدیکە و ئەویتر، ئیتر چ کورد بێ چ عەرەب، چ لاز و چەرکەس بێ چ ئەرمەن یان یۆنانی یان بولگاری، هەموو وەك سەرچاوەیەکی ترسناك بۆ سەر تورك و تورکایەتی لە قەڵەم دەدرێن. ئەم ناسیۆنالیزمە شێتانە و بکوژەی تورك، سەرچاوەکانی سەرەڕای ئەوەی کە  بە دەستی  ڕۆژئاوا، بە تایبەتی هەندێ لە ڕۆژهەلاّتناسە جولەکەکانی ئەلمانیا و فەرەنسا و یۆنانستان دروستکراوە، ئەوان دەستیان هەبووە لە دروستکردنی یەکەمین نوخبەی ناسیۆنالیستی تورکی، لەگەڵ ئەمەش تورکەکان حاڵەتی یان سیفەتی ئیدیالی تورکایەتی خۆیان پێ بەخشیووە، ئەم سیفەتەش بە پلەی یەکەم ئەخلاقێکی عوسمانی بوو، کە سەرەتا بە هەمان جۆری ئەخلاقی شێتانە ئیسلامیان گرتبوو، ئەم ناوکەیان گواستەوە ناو ناسیۆنالیزمی تورکی نوێش. ئەمەش وەك هەستێکی ئیدیالی شێتانەیە (وەك حاڵەتێکی عوسابی گشتی لە شێوەی پارانۆیا و شیزۆفرێنیا)یە و ئەوان بە گەرانتی پاراستنی تورکی لە قەڵەم دەدەن، ئەم هەستەش بنچینەیەکی ئیدیۆلۆژی و ئەخلاقی فاشیستانەی لە پاڵە، بەو مانایەی لە لای ئەوان (هەروەکو مێژوونوسە ڕەسمی و نارەسمییەکانیان دایان ڕشتووە) و دەڵێن : هەموو جیهان تورکە، نەژادی هەموو میللەتان لە تورکەوە دێ، یەکەمین نەژاد لە جیهان

نەژادی تورکە، ...هتد، ئەم دیاردەیە ئەوەندە گەورە کراوە و بە ئیدیالکراوە بە ڕادەیەك مرۆڤ بێز و هێڵنجی دێتێ، چونکە لە سەروبەندی هەموو گرفتێك تورکەکان بە ڕادەیەکی زۆر ئەم هەستەی خۆیان پیشان دەدەن، ئەو هەستەش دەدەنە بێگانەکان کە لە لای تورکەکان گاو مانگا، مریشك و جوجەڵە، دارودیواریش ...هتد، تورکین. ئەو ماوە کەمەی لە تورکیا بووم، نوخبەی ناسیۆنالیستی تورکی و دەزگا ناسیۆنالیستە دەوڵەتییەکان، ڕێکخراوە ناسیۆنالیستە تورکییەکان، کۆمەڵانی خەڵکیان بە لێشاو دەڕژاندە سەر شەقام و کۆڵانەکان و گۆڕەپانەکان، هوڕا و سلۆگانیان دژی کورد دەدا، وێڕای گوتنی (ئەلاهوئەکبەر) بە کۆڵانەکان بە لێشاو تێدەپەڕین . دەوڵەت و سوپا و دەزگا و ڕێکخراوەکان و مێدیای تورکی بە ئاشکرا دنەی خەڵکیان دەدا بێ دەنگ نەبن و خۆپیشاندان بکەن، بەڵام مرۆڤی هوشیار و بە ئاگا دەپرسی ئەم هوڕاو سلۆگان کێشانە لە پای چی ؟ ئایا خەتەرییەك لە سەر میللەتی تورك هەیە؟ ئایا بە ڕاستی خەتەرییەك لە سەر میللەتی تورك هەیە؟ بێگومان نەخێر. کەواتە ئەم هەموو گەڕەلاوژەیە لە پێناوی چی؟! تەنیا لە پێناوی ئەوەی میللەتێك داوای مافەکانی خۆی دەکاو دەیەوێ وەك مرۆڤ سەیری بکەن، لێرەوە کام میللەت بوونی لە خەتەردایە تورك یان کورد؟ کەواتە کێشەیەکی ئالۆز لە خودی تورکەکان هەستی پێ دەکرێ، لە خودی کولتور و بنەماکانی فەلسەفەی سیاسی و ئەخلاقی ئەو وڵاتە. بێگومان خەڵکێکی هوشیار هەیە لە تورکیا وەك ئەم زۆرینەیە بیرناکەنەوە، هەیانە ڕاستەوخۆ لەگەڵ مافی چارەنووسی کورد دان، بەڵام ئەمانە کەمایەتین و هیچ کاریگەریەکیان لە سەر زۆرینە نیە. سەرەنجام، ئەو هەستە ناسیۆنالیستە تورکییە وەك حەیوانێکی دڕندەیە و لە هەناویان ئۆقرەی نیە، ناوە ناوە دەردێ و کەتنێك دەکا. دواجار تورکەکان ئەگەر بیانەوێ وڵاتێکی دیمۆکراسی بنیات بنێن دەبێ لە دەستور و تەواوی دەزگا و ڕێکخراوە دەوڵەتیەکانیان ڕیفۆرمی قووڵ بکەن، بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێ بتوانن لەگەڵ میللەتانی تر بژین، بە پێچەوانەوە، دوور یان نزیك ئەم دەوڵەتە بەم سیستەمە ئیدیۆلۆژییەی ئێستا دووچاری هەمان شکستی عوسمانی دەبێتەوە.

# زەمەنی مرۆڤ و زەمەنی فیزیکی

پێم سەیر نیە کە بابەتێکی لەم جۆرە تا ئێستا نەبۆتە کەرستەی سەرنجدان و تێبینی نووسەران و ڕۆشنبیران، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە هێشتا هونەری بیرکردنەوە لای ئێمە بایەخێکی ئەوتۆی نیە، یانیش ئەوەتە بە شتێکی خەتەری دادەنێن و لە ترسی سەرلێشێوان خۆیانی لێ لا دەدەن. بە گشتی، مرۆڤی ڕۆژهەلاتیی بە قەد ئەوەی کاری پەرستن دەکا بە قەد ئەمەش بیری بکردایەتەوە هیچ کێشەیەکی نەدەما.

ئەم ناونیشانە لە بنچینەدا کێشەیەکی تیۆری مێژوویی و فەلسەفی و زانستییە، زۆر کەم سەرەنجی توێژەرانی بۆ خۆی ڕاکێشاوە. پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ئەدەب و هونەر و بە گشتی بوون و بیرکردنەوەی مرۆڤەوە هەیە.

زەمەنی مرۆڤ دیاردەیەکە لە ناو زەمەنی فیزیکی، دەشێ ئەمەی دوایی ناو بنێین زەمەنی گشتی، زمەنی مرۆڤیش بە زەمەنی زاتی بچوێنین.

جیاوازی لە نێوان ئەم دووە چیە ؟ هەروەها ئەم دووە چۆن پێناسە دەکرێن. لێرەوە هەوڵدەدەین وەلامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە، بێجگە لەمە هەوڵدەدەین ناسراوترین تیۆر لەم بارەیەوە بخەینەڕوو کە لە بواری ئەدەب و هونەر لە لایەن ڕەخنەگرانی هاوچەرخی فرەنسی گرینگی پێدراوە، لە بواری فەلسەفە و مێژوودوە فەیلەسوفی ئەلمانی ناسراو ماکس ڤیبێر گرینگی پێداوە، نەك هەر

ئەمەندە بەڵكو تەواوی ڕوانینی خۆی لە سەر ئەم جیاكارییەی نێوان زەمەنی مرۆڤ و زەمەنی فیزیكی بنیات ناوە.

زەمەنی مرۆڤ واتە زەمەنی مێژووی مرۆڤ، زەمەنی هوشیاری مرۆڤ، (خوێنەر دەبێ بزانێ ئێمە مەبەستمان لە زەمەن وەخت نیە، بەڵكو مەبەستمان لە زەمەن زەمەنە بە مانا فەلسەفییەكەی كە هاوتای شوێن دەوەستێ، دەشێ لە زمانی كوردی وشەی سەردەم لەم مەبەستە نزیك بێ) دواتر زەمەنی ئازار و ئەشكەنجەو بە گشتی ژیان و داهێنانەكانی مرۆڤ. لە زەمەنی مرۆڤ، هەموو دیاردەیەكی مرۆیی لە بەرەبەیانی مێژووی مرۆڤەوە تا ئەمڕۆ دەگرێتەوە، شێوازی ژیان و بیری مرۆڤ، بە گشتی هوشیاری مرۆڤ. ئەم زەمەنە وەك ئەنجامێكی یان بەرهەمی زەمەنی فیزیكیە، بەلاّم زەمەنی فیزیكی زەمەنێكە بێ هوشیاری، بێ مێژوو، بێ ئازار و بێ ئەشكەنجە و بێ هوشیاری و بێ داهێنان. سروشت بە هەموو جوانی و ناشرینی و ترس و بیمیەوە كەرستەو داهێنانی زەمەنی فیزیكیە، زەمەنی فیزیكی واتە بوون، بوون وەك بوونی موجەرەد، مێژووی گەردوون، بە كورتی گەردوون و بوون بە مانا فەلسەفی و فیزیكیەكەی كە لە دەرەوەی مرۆڤن، ئەوە مرۆڤە هوشیاری هەیە دەتوانێ هەست بەو بوونە بكا، هەروەها وردتر بێتەوە جیاوازی لە نێوان ئەم دوو زەمەن و بوونە بكا كە بە زەمەنی مرۆڤ و زەمەنی فیزیكی ناسراوە.

دەشێ ئەم دوانە بە دوو گەردوون بچوێنین، گەردوونی مرۆڤ و گەردوونی فیزیكی، گەردوونی مرۆڤ بریتیە لەو ژیان و مێژووەی لەسەر گۆی زەوی هەیەتی، بەلاّم ئەویتر گەردوونی فیزیكییە كە مرۆڤ لە هەوڵدانە بیناسێ و تێی بگا.

دەشێ زەمەنی مرۆڤ چەند ساتێك بێ لە چاو زەمەنی فیزیكی كە وەك گەردوونێكی بێ پایان دێتە بەرچاو. زەمەنی مرۆڤ واتە زەمەنی ئەقڵ، زەمەنی هوشیاری. مرۆڤ بۆ خۆی وەك بوونەوەرێكی ماددی ئەنجامێكی یان داهێنانێكی گەردوونی فیزیكیە، بە كورتی ئەنجامێكی سروشتە، بەلاّم هوشیاری دەگەڕێتەوە بۆ سروشتێكی دیكە كە لە سەرەوەی سروشتی فیزیكیە.

لـه نـاو ڕەخنـەگرانی قوتابخانـەی ڕەخنـەی ژنـێڤ، یـەکێ لـەو نووسـەر و ڕەخنەگرانەی زۆر گرینگیان بەم لایەنـە داوە جـۆرج پـوولێ یـە، جـۆرج پـوولێ کتێبێکی دوو بەرگی ناسراوی هەیـە بـە نـاوی (زەمـەنی مـرۆڤ، لێکۆڵینـەوەی ڕەخنەی ئەدەبی فرەنسی) نـاوبراو تـەواوی ئـەو داهێنانـە ئـەدەبی و هونـەری و فەلسەفیانەی خستۆتە ژێر لێکۆڵینەوەی خۆی، کە لەم سـەد سـاڵەی دوایـی لـە لایەن نووسەرانی داهێنەری فرەنسی نووسراون، ئەمـەش هـەمووی بـە سروشـتی مرۆڤ لە قەڵەم دەدا کە جیاوازی هەیە لە سروشـت خـۆی وەك فیزیـك. هەڵبـەت سروشتی مرۆڤ جیاوازە لە سروشتی فیزیکی، بیرکردنـەوە و ژیـانی شارسـتانی و پەیوەنـدی ژن و پیـاو، خـەباتی مـرۆڤ بـە گـشتی و پێکهاتـە و پەیوەندییـە کۆمەلایەتییەکان و زاتییەکان و کێـشەکانی نـاوەوەی مـرۆڤ وەك بوونـەوەرێکی هوشیار لە واقیع و لە بوون (گـەردوون و لـە سـەر زەوی) گـشتیان کەرسـتە و بابەتی ئەون. بێگومان پەیوەندییەکی خەست و ئاڵۆز هەیـە لـە نێـوان سروشـتی مرۆڤ و سروشتی زەوی (سروشتی فیزیکی) وەك ماڵێك بۆ مرۆڤ، بـەلام ئـەم دوو سروشتە هەردەم بە تەنیا و بە جیا و سەربەخۆ گەشە دەکەن. مرۆڤ دەسـتی بـە سەر سروشتی خۆیدا دەشکێ، دەتوانێ دەسکاری بکا و باشـتر و خـراپتری بکـا، گەشەی پێ بداو تێیدا پاشەکشە بکا. داهێنانەکان و بووژانـەوەکان لـە پێنـاوی باشتر کردنن، بەلام جەنگ و توند و تیژی و لە ناوبردن لە پێناوی خراپترکردنیەتی کە بە ناوی باشترکردنی دەکرێن. بەلام مرۆڤ دەستی بە سەر سروشتی فیزیکی دا ناشکێ. بێگومان بە شێوەیەکی لابەلا لە سەر ئاسـتێکی زاتـی دەتـوانێ ئەمـە بکا، بەلام بە پێچەوانەوە، لە سەر ئاسـتێکی گشتگیری مەحاڵە ئەم کارە بکـرێ. مرۆڤ سروشتی فیزیکی بە پێی توانای خۆی ڕێکدەخا، ئەمەش دەشێ هەر نـاوی لێ بنرێ سروشتی مرۆڤ.، دروست کردنی شار و گونـد و ...هتـد، بەشـێکن لـە سروشتی مرۆڤ نەك سروشتی فیزیکی.

ماکس ڤیبێر گـەورە فەیلەسـوف و بیرمەنـدی ئـەلمانی زۆر گرینگـی بـەم لایەنەوە داوە، ئەو ڕاستەوخۆ مێژوو وەك مێژوو، وەك چەمکێکی سـەربەخۆ لـە مێژووی سروشت و بوون دەردێنێ، لای ئەو مێژوو تـەنیا مێـژووی مرۆڤـە، لـە

غەیری مرۆڤ زیاتر لە ناو گەردوون مێژوویەکی دیکە نیە. ئەم مێژووەش بریتییە لە مێژووی هوشیاری مرۆڤ، لەو چرکەیەوە کە هەستی کردووە کە هەیە و بیردەکاتەوە. ئەو گەردوون و فیزیك و زەمەنی فیزیکی بە دیاردەیەك لە دەرەوەی ژیانی مرۆڤ دادەنێ، ئەو پێی وایە سروشتی فیزیکی هوشیاری تێدانیە کە بە پێچەوانەوە کرۆکی مێژووی مرۆڤ داگیر دەکا. بوومەلەرزەیەك یان نغرۆبوونێکی زەوی، لافاو و تۆفانێك، بەحرو بیابانی بێ پایان هەموو ئەمانە بوونێکیان هەیە لە دەرەوەی دەستەلاتی مرۆڤ، مرۆڤ بەرامبەر بەم رووداوانە هیچ خوێندنەوەیەکی نیە لە غەیری ئەو خوێندنەوەی سروشت خۆی پێشکەشی دەکا. ئەو چرکەیەی مرۆڤ بتوانێ سروشت کۆنترۆل بکا یان بیکاتە سروشتێکی بیرکەرەوە وەك مرۆڤ خۆی، بتوانێ بوومەلەرزەیەك ڕابگرێ، کە مەحاڵە بۆ مرۆڤ، ئەوسا مانای وایە مرۆڤێکی دیکە لە دایکبووە کە پێی دەگوترێ سوپەر مرۆڤ.

# هێزی ئاسنینی پڕ لە ڕۆشنایی

...سەیرە، دیاردەیەکی ترسناکە، چۆن حکومەتی ئێمە، پارتە سیاسییەکان، ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و ژینگە و تەندروستی و کار و کۆمەلایەتی، هەست بە خەتەری ئەم دیاردەیە ناکەن لە سەر نەتەوە و ئایندەی کورد، ئەو خەوە ترسناکە چییە تێی کەوتوون، ئەو نووستنە مێژووییە، ئەو بۆرژانە پڕ لە گێلی و گەمژەییە چییە لە ناویدا دەژین. ئایا مرۆڤ تەنیا پاش ترازێدیایەك ئینجا دەبێ بیربکاتەوە، ڕاچڵەکێ و بێداربێتەوە ؟ ئایا ئەمە لە خۆیدا هەلکەوتێکی کۆمیدی نیە ئێمە تێیدا دەژین ؟ لەم حالەتەدا شوێن و هەلکەوتی ئەمانەی سەرەوە چین لە ناو پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان، ئەمانە مرۆڤن یان قەپێلکن بە بەرچاویان ڕووداوی ترازێدی ڕوودەدا، جوولە ناکەن، هەلوێست وەرناگرن، ئەی دەستەلات لە کوێیە، دەستەلاتی ئاسنینی پڕ لە ڕۆشنایی، ڕۆشنبیرە ڕاچەنیوەکان لە کوێن؟ بە نوێژی نیوەڕۆ ژن و کچ و دایك و خوشکیان دەخنکێنرێ، دەکوژرێ، بە سوزانی دەکرێ، زیندانی دەکرێ...هتد.

هەر ژن نا، بەلکو مندالّ و پیر و پیاوی غەدر لێ کراویش هەیە، کۆمەلێك ژن هەن، ژنی مێشك پووتی خەوتوو، پیاوی مێشك پووتی خەوتوو، کۆمەلّی مێشك پووتی خەوتوو، ئێمە پێویستیمان بە بێداربوونەوە هەیە، دەستەلاتی حکومەتی ئێمە پێویستی بە بێداربوونەوە هەیە، دەستەلات دەبێ قانون بە دەنگی بەرز و بە یەکسانی و بە دەست و برد پەیڕەو بکا، هێزی ئاسنینی پڕ لە ڕۆشنایی، ئەوانە بکاتە پەندی زەمانە کە ژن دەکوژن و دەسووتێنن، کە غەدر لە پیاوانی پیر

دەکەن، کە منداڵان دەچەوسێننەوە، دەستەڵاتی ئێمە، هی حکومەت دەبێ لە ناو ڕۆشنایی و جیهان بینی نوێ، لە ناو عەدالەت و یەکسانی چەپۆکێکی ئاسنین دروست بکا، خیانەت و غەدر لە هەر سەرچاوەیەکەوە بێ لە ناوی بەرێ، دەستەڵاتی حکومەت و پارتە ڕۆشنەکان و کەسانی ڕۆشن، لەم بارەیەوە حسێب بۆ پایەی کۆمەڵایەتی، خزمایەتی، بەرژەوەندی تەسکی کۆمەڵان و کەسان نەکەن، چونکە ژن کوژی و ناعەدالەتی بە هەر جۆرێك بێ دەبێتە خەتەری لەسەر خۆی، عەدالەتی بە قەد مەسەلەی دیمۆکراسی و ئاشتی و مافی ژیان و کوردایەتی و چارەنووسی نەتەوە و کۆمەڵانی ئێمە، کێشە سیاسیەکانمان گەورە و گرینگە، لە هەر کۆمەڵێك عەدالەت نەبێ، ئەو کۆمەڵە ڕووی لە لێژییە، ئاوەژوو دەبێ، بەرەو تێکچوون، بەرەو نغرۆبوون، بەرەو هەڵوەرین دەچێ، بۆیە، بێداربوونەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و شارستانیمان دەوێ، دەمانەوێ وەك کورد ناسنامەمان دیاربێ، کۆمەڵمان پوختەبێ، تاکەکانمان ئازاد بن، مافی ژیانیان هەبێ، پەیوەندییەکانی نێوان ژن و پیاو بەرەو باشی ببەن، ژن لە خۆڕا نەسووتێنرێ، ژن نەکوژرێ، ناعەدالەتی بەرانبەر بە منداڵ و پیر نەکرێ، ئەوە درۆیەکی گەورەیە دەڵێن ژنەکان خۆیان دەکوژن، ژنەکان خۆیان دەسووتێنن، ئەوە پیاوی مێشك پووتە ئەم کارە دەکا، پیاوی نێگەتیف، پیاوی خەوتوو، ژنی خەوتووش یاریدەدەریەتی، پیاوی مێشك پووتی پڕ لە کوێرەوەری و پڕ لە تاریکی و پڕ لە قەشمەری و پڕ لە پەتاتە، دوور لە تێبینی و بیرکردنەوە، دوور لە هەڵوەستە و سەرنجدان، دوور لە ڕۆشنایی، بە داخەوە لە ڕۆژهەڵات، لە ولاتانی ئێمە، کەمترین ڕادەی بیرکردنەوە هەیە.

لە هەر بوارێکی دەیگری، بە تایبەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ئێمە لە ناو خەوێکی قووڵدا دەژین، لە داواکردنی مافەکانی خۆمان دەترسین، وەك کورد، وەك میللەتێکی کەونارا و مەزن لە داواکردنی مافەکانی خۆمان دەترسین، لە کاتێکدا ئەو مافانە دیارن، وەك ڕۆژ دیارن، تاکەی دژی ئەم چەوساندنەوە مێژووییە ڕانەپەڕین، بێدارنەبینەوە، لە لایەك عەرەب، لە لایەك تورك، لە لایەك فارس، لە لایەکی تر کوردە خۆفرۆش و بەکرێ گیراوەکان، هەموویان، لەژێر

ئیدیۆلۆژی و مەزهەب و باند و سلۆگانی جیاجیا لە هەوڵ و خەباتی بێ وچـاندان لە ناومان بەرن، بەڵام کورد خەوتووە و بێدار نابێتەوە، زیاتر لۆژیکی راوورِووت و دەسـتکەوت جێگـای کوردایـەتی گرتۆتـەوە، بـیر لـە ژنکـوژی و ژن سـووتاندن دەکەنەوە، بەڵام بە ڕاستی دیاردەیەکی زۆر سەیرە، شتێکە زۆر دووبارە دەبێتەوە، کۆمێدیایەکە کۆتایی نایێ، تراژێدیای ئارایشت کراو بـە کۆمێـدیا، کۆمێـدیای ئارایشت کراو بە تراژێدیا، ئەی مرۆڤە ڕاچەنیوو و هۆشیارەکان لە کـوێن، بـەڵام ئێمە مرۆڤی هۆشیارمان هەیە؟ بەڕاست ئێمە مرۆڤـی هۆشـیارمان هەیـە، یـان مرۆڤێکمان هەیە لە هۆشیاری هەڵدێ؟

بەڵام کەی دەستەڵاتی ئاسنینی پڕ لە ڕۆشنایی و عەدالەت لە دەڤـەری ئێمـە دەکەوێتە کار؟ کەی بە دەنگی بەرز هەلکەوتە کۆمەڵایەتیە پووچ و نێگەتیڤەکان لە ناو دەبا، مرۆڤە مێشك پووتەکان دەم کوت دەکا، ئەو مرۆڤانـەی خەتـەرییان هەیە لە سەر کۆمەڵ، ئەو مرۆڤانەی خەتەرییان هەیە لە سەر پرۆسەی سیاسـی، جاشـە مۆدێرنـەکان، جاشـەکانی کۆمەڵایـەتی، جاشـە کارگێڕییـەکان، جاشـە حیزبییـەکان، جاشـە گەندەڵـەکان، جاشـەکانی ڕاووڕووت، جاشـەکانی بـواری ڕۆشنبیری، ژن کوژەکان، ژن سووتێنەرەکان، ئەوانەی غەدری کۆمەڵایەتی دەکەن، لە ژن، لە منداڵ، لە پیر، لـە بـواری سیاسـی، لـە کـورد، لـە کوردایـەتی، لـە دیمۆکراسی، لە مافی مرۆڤ، لە ژینگە...هتد.

شتێك هەیە دەمەوێ بە بیرتان بهێنمەوە: هەر کۆمەڵێك لە ناوەوە عەدالـەت و دیمۆکرات بێ، هەر کۆمەڵێك لە ناوەوە حکومەتەکەی بە دەستەڵاتێکی پـڕ لـە ڕۆشنایی و چەپۆکی ئاسنین فەرمانڕەوایی بکا، هەر گەلێك لە ناوەوە عەدالەت و بە هێز بێ بە پەیڕەوی قانون و دیمۆکراسی، بە هیچ دوژمنێك ناڕووخێ، نە ئێـران نە تۆران زەفەری پێ نابەن. کورد ناچارە نەوها بێ، چونکە لەمە زیاتر ڕێگایەکی تر نیە، بەڵام کورد دەبێ بێداربێتەوە، بێداربێتەوە و سەیری خۆر بکا.

# یاداشت و ناسنامە

مەسەلەی سەرەکی ئەمڕۆیە، مێژووی ئەمڕۆ، ئێستا، نەك ڕابردوو، هەڵبەت ڕابردوو بۆ ئێمە گرینگە، ژیانێکە ئێمە تێیدا ژیاوین، زۆر شتی لە دەستچووە، زۆریشی لە دەست نەچووە، ئەوەی بە پلەی یەکەم گرینگە ئەوەیە هەردەم بەرەو ئاییندە بچین، بچین بەلاّم کە دەبێتە ڕابردوو هەست بەوە نەکەین شتمان لە دەست چووە، ئەمەش واتە ئێستا و ئاییندەیەك بە تەواوی لە دەست خۆمان بێ.

ئەوەی باسی دەکەم بەم وشە سادانە، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە یاداشت و ناسنامەوە هەیە، یاداشت و ناسنامەی نەتەوەیەك، لە شێوەی کورد کە لە ناو چ داڕزانێکی سیاسی جیهانی دەژیێ، مەبەستمان لەمە، لە ناو جیهان هەر ئێستا خاوەنی هیچ ناسنامەیەکی سیاسی نین (لە شێوەی دەوڵەتێك)، یاداشتمان هەیە، بەلاّم یاداشتمان لە ناو هێرش و داگیرکاری دوژمنان و بێگانان شاردراوەتەوە، یان هەردەم لە ئەنجامی ئەو ناکۆکی و ململانێ سیاسییەی لە ناوچەکە هەیە، لە بزووتنەوەی چوونەپێش و پاشەکشە دایە، جێگیر نیە، یاداشت واتە مێژوو بە هەموو ئاڵۆزی و سادەیی خۆی، یاداشت هەردەم لە بەرامبەر ناسنامە دەوەستێ، ناسنامە واتە بوونی چوارچێوەیەك و هەڵکەوتێکی جێگیری سیاسی نەتەوەیەك، ئێمە لەبەر ئەوەی ئەم جێگیرییە سیاسیەمان نیە، دەبینین ناسنامەیەکی سیاسی جێگیریشمان نیە، ئەمەش زۆر جیاوازە لە ناسنامەی کولتووری کە زیاتر لایەنەکانی یاداشت دەگرێتەوە، بە کورتی کیانێکی سیاسی جێگیرمان نیە لە پاڵ کیانی میللەتانی دیکە ئەو یاداشتە بپارێزێ و هەروەها یاداشتێکیش بۆ ئایندە دروست بکا. ئینجا کێشەکە لێرەوە دەست پێ دەکا، چەشتنی ئازاری بێ

ناسنامەیی و بێ وڵاتی بە ڕای من لە کۆیلایەتی خراپترە، میللەتێك چۆن دەبێ کۆیلایەتی قبول بکا، چۆن دەبێ لەسەر گۆی زەوی میللەتێك هەبێ کۆیلە بێ، ناسنامە و یاداشتی خۆی لێ زەوت بکەن، بە دیواری دادەن و لەبەر چاوی خۆی ڕەشی بکەنەوە، ئەمە ئەو حاڵەتەیە لە لای من هەردەم بابەتێکی هەستیار بووە، لە ماوەی ئەم بیست و پێنج ساڵەی ڕابردوو هەردەم تێیدا ژیاوم، ئاوارەیی و ئازار چەشتن بە دەستی بێگانان، بە نهێنی پەڕینەوە لە سنووری ناسنامەکان، واتە دەوڵەتەکان، دەوڵەتانی بێگانە، ڕاوەدوونانی پۆلیس و پشکنین و لێکۆڵینەوە لەگەڵ کردن...هتد، لەم هەموو کەین و بەینە من تەنیا پشتم بە یاداشتی خۆم و هێزی تێبینی خۆم بەستبوو وەك کوردێك، کوردێکی بێ وڵات، ڕاستە ئێمە یاداشتمان هەیە، بەڵام ناسنامەمان نیە، ناسنامەی سیاسی، چونکە لە سەر خاکی خۆمان دەژین بەڵام وەك بێگانە حسێبمان بۆ دەکەن، هەڵبەت لە لایەن ناسنامەکانی ترەوە، ناسنامەکانی تر وەك بێگانە و دەستەمۆ و کۆیلە سەیرمان دەکەن، ئەوان حەز دەکەن هەردەم خاوەنی ئێمە بن، ئێمەش وێڕای خەمساردی و هەلکەوتی قەدەر و هەلکەوتی سیاسی و جیۆپۆلیتیکی، نەمان توانیوە بەگوڕ و تینەوە خۆمان دەرباز کەین، دەربازکردنێکی مێژوویی، لە شێوەی هوشیاربوونەوە و هەڵسانەوەیەکی مێژوویی بە تین و ناوێزە، خۆمان لە یاداشتی فەرزکراوی بێگانە ڕزگار بکەین، ئەمەش ئەو پەیوەندی و هەلکەوتە ئالۆزەیە کە تێیدا دەژین، هەر لەبەر ئەوە، ئیمرۆ کە باسی بوون بە خاوەنی یاداشت و ناسنامەی تایبەت بە خۆمان، لە ئێستا و داهاتوو دەکەم، دووچاری کۆمەڵێك پرسیار و گومان کردن دەبمەوە، ئەمەش ڕاستەوخۆ ئاراستەی چینی ڕۆشنبیری کوردی دەکەم (لێرەش مەبەستم لە چینی ڕۆشنبیری، ئەو حاڵەتە هەستیارییە جیهانیەیە کە هەموو تاکێکی هەستیار و ڕوناکبیری کوردی و کوردستانی تێیدا دەژین)، بە داخەوە بەرامبەر بەم کۆیلایەتی و دەستەمۆییە هوشیار نینە، ئەو خەمساردییە چییە تێیدا دەژین، ئەو دەستەمۆییە چیە تێیدا دەژین، ئەو ئەنانیەت و دڵپیسیە چیە تێیدا دەژین، ئایا ئەوان ئەو ئازارەیان هەست پێ کردووە کە لە سەر گۆی زەوی دەژین و کۆیلەنە، لە سەر خاکی خۆیان دەژین، بەڵام نازانن سنووریان لە

کوێیە، ژیانیان چۆن گوزەر دەکا، ئاینده چۆنە، سبەی چی چاوەڕێمان دەکا؟ لێرەوە جێگای خۆیەتی باس لەو دیاردەیە بکەم، کە هەڵوەستەی گرینگی دەوێ، ئێمە هەر ئەمڕۆ حکومەتێکی ساوامان هەیە، هەزاران کێشە و گرفتی هەیە و هەزارانی دیکەی بۆ دروست دەکەن، لە ناو پەیوەندییەکی ئاڵۆزی جیۆپۆلیتیکی دەژیێ، هەموو دەمێ خاکمان کراوەیە دوژمنان هێرش بکەنە سەرمان (هەروەکو چۆن ئێستا تورکەکان دەیکەن)، بەلام نوخبەی ڕۆشنبیری کوردی خەوتووە، ئەوان، لە ناو ئەنانیەت و بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆیان خەوتوون، تەنیا چاویان لە دەست و گیرفانی خۆیانە، ئایدیا بەرز و نایابەکانی یاداشت و ناسنامەیان نابینن، نازانن ژیان بە ئازادی لە ناو ولاتێکی ئازاد، ژیان لە ناو ناسنامە و یاداشتییێکی جێگیر چ بەها و نرخێکی هەیە، بە داخەوە ئەوان هەستی پێ ناکەن، هەستی پێ ناکەن چونکە ئەوان قەت موچرکەی بوون و نەبوونیان پێدا نایێ، چونکە ئەوان قەت پرسیاری مێژوویی لە خۆیان ناکەن، هەتا ناشپرسن ئێمە چین، ئێمە کێین ؟ بۆ بێ ولات و بێ ناسنامەین ؟ بە ڕاست ئەم شتانە سوودی چی هەیە لە پاڵ گیرفان بەتاڵی ؟ ئەوان ئەم پرسیارە ئاوەژوو دەکەنەوە و دەڵێن کە گیرفانت بە تاڵ بوو ولاتت بۆچییە !! کێشەکە لێرەوەیە، ئەنانیەتی تاکەکەسی، بەرژەوەندی تاکەکەسی هەموو ئەوانی داپۆشیوە، لە کاتێکدا خەبات کردن بۆ وەدەست هێنانی ناسنامە و یاداشت، بۆ وەدەست هێنانی ولاتێکی ئازاد، پێویستی بە فەردییەتێکی ڕۆشن و لە خۆبووردوو هەیە، نەك فەردیەتێکی ئەنانی، لێرەوە، من ڕەخنەکەم لە چینی ڕۆشنبیرانی کورد توندتر دەکەمەوە کە ئەوان هیچ کاتێك، (بێجگە لە هەندێکیان) وەك ئەم فەردییەتە ڕۆشنە کە وێڵە بە دوای دروست کردنی ولاتێك و ئازادییەك و ناسنامەیەك خۆیان پیشان نەداوە، بەڵکو هەر ئەمڕۆ ئەگەر سەرنجی میدیا و ناوەندی ڕۆشنبیری کوردی بدەین، فەردییەتێکی ئەنانی و خۆپەرستانە و بەرژەوەند خواز لە ناویان هەیە، بێ باکن بەرامبەر بەو هەڵکەوتەی کوردان تێیدا دەژین، کە ئەویش خۆی لە دروست کردنی ولاتێك و پاراستنی ئەم ئەزموونە دەدۆزێتەوە.

## ئەمریکا : هیوای جیهان

دیاردەیەکی زۆر سەیر و ناوێزە لە ناو بیرکردنەوەی میللی ئێمە باوە کە دەشێ ڕەگ و ڕیشەیەکی ئالۆزی هەبێ، هەندێ جاریش هەمان بیرکردنەوە وەك سەرەنجامێك بەکاردەهێنرێ بۆ بێ دەنگ بوون و بیرنەکردنەوە یان هەلوێست وەرنەگرتن، ئەم دیاردەیەش زۆرجار، یان هەمیشە دەدرێتە پاڵ بەهێز و گەورەکان، یان باشتر زلهێزەکان. هەتا زەرقاوی گۆڕبەگۆڕ نەکوژرابوو، هەزاران جار لە کۆڕ و کۆبوونەوەکان، کە هەندێ جار پیاوی لێوەشاوەشی تێدابوو، دوای هەر کردەوەیەکی تیرۆرستی زەرقاوی، زۆر بە ئاسانی دەیانگوت : ئەمریکا خۆی ئەم کارەی کردووە، یان بە ئاشکرا دەیانگوت زەرقاوی پیاوی ئەمریکایە، بەم هەلوێستە مەجلیس کپ دەبوو، بێدەنگی بەرقەرار دەبوو، خەلکەکە دەکەوتنە ناو بیرکردنەوەیەکی ئالۆز و چەواشەکار. دواجار گفتگۆ دەبردرایەوە لایەکی دیکە، لە کاتێکدا بە ئاشکرا دەتبینی دەیان پرسیار لە فەزاو ساپیتەی دانیشتنەکە بە هەلواسراوی ماونەتەوە و چاوەڕێی بیرکردنەوە و وەلامدانەوە دەکەن.

ئەرێ راستە زەرقاوی پیاوی ئەمریکایە ؟ یان ڕاست بوو پیاوی ئەمریکابوو ؟ (ئەم پرسیارەش هێشتا زیندووە چونکە دەیان زەرقاوی هێشتا لە گۆڕەپانن !) ئەگەر وایە ئەی بۆ بە دەستی ئەمریکا و هاوپەیمانە عێراقییەکان کوژرا !؟ بیرکردنەوەی میللی ئێمە دەلێ نەخێر، ئەمریکاو عێراقییەکان زەرقاوییان نەکوشتووە، بەلکو ئەمە ئیسرائیلە کوشتوویەتی، ئیسرائیل فێلبازترین دەولەتی جیهانە، بەهێزترین سێرڤیسی نهێنی هەیە، بە تاکتیکترین سوپای هەیە،

بێگومـان ئـەمریکا و ئۆروپاشـی لـە پشتە. (ئەمـەش لـە لایـەك جەهالـەتی خوێندنەوە پیشان دەدا، لە لایەکی دیکە شەرعییەتدانە بە مەغدوری بزووتنـەوە ئیسلامییەکان) لە پاڵ ئەمەش جارێکی دیکە بیرکردنەوەی میللی ئێمە دڵنیایی لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەمریکا زەرقاوی دروست کردووە، هەر ئەمریکاش بـۆ خۆی لە ناوی بردووە. ئەمەش پێی دەگوترێ مەنجەنیقی بیرکردنەوە، یـان زۆر بـە کورتی پێی دەگوترێ بیرنەکردنەوە. بێگومان بیرنەکردنەوە پانتاییـەکی زۆری لـە ناو ژیانی ئێمە داگیر کردووە، بیرنەکردنەوە ماشـێنێکی مەزنـە هـەموو شـتێك لەسەر رێگای خۆی پان دەکاتەوە، بەکورتی رۆژهـەلات و بیرنەگردنـەوە هاوتـای یەکترن. لەم رۆژهەلاتە هەر زلهێزێك جلەو بگرێتە دەست، نیتر لە رێگای تیرۆر و توند وتیژی بێ یان لە رێگای فەزیلەت و حیکمەت (لەمەش مەبەسـتم پرۆسـەی دیمۆکراسییە) راستەوخۆ تاوانبار دەکرێن.ئەم دیاردەیەش لـە ڕوانگـەی مـن دوو لێکدانەوە هەڵدەگرێ، یەکێك بۆ ئەمریکا، ئەویدیکە بۆ سەرچاوەی بیرکردنەوە و روانینەکە کە بۆ ئەوبیرکردنەوە میللیە هەیە.

ئەمریکا ولاتێکە بەلکو مەزنترین ولاتی سەرگۆی زەوییە لـە رووی هێـز و پرۆسەی سیاسی و حوکم کردن و شێوازی دیمۆکراسی و بەرهەم هێنـان. ئـەمریکا سادەترین دەستوری هەیە، بەلام بەهێزترین و تۆکمەترینە، سیستەمێکی حوکمی هەیە کە لەسەر ئازادییە بنچینەییەکان دامەزراوە. ئازادی بیرکردنـەوە، ئـازادی بیروباوەڕی ئایینی و ئازادی سیاسی، ئازادی کارکردن و گەیشتن بە سەرچاوەکانی دابینکردنی ژیان بە یەکسانی بۆ هـەموو کەسـێك. دەشـێ بلێـێن مـەزنی ئـەم دەستوورە و ئـەم سیـستەمی حـوکم کردنـە بەرزکردنـەوەی مرۆڤـە بـۆ ئاسـتی شایستەی خۆی نەك بە پێچەوانەوە بچووك کردنەوە و قەتیس کردنی لە ژێر ناوی ئایین یان بیروباوەر یان هـەر هەلکـەوتێکی تـری ئیـدیۆلۆژی. هەلبـەت لێـرەوە مەبەست لەوە نیە کە دەوڵەت کۆنترۆلی خۆی نیـە، بـە پێـچەوانەوە مەزنایـەتی دەوڵەت لە هەناوی هەموو تاکێك هەیە، ئەمەش بە شـێوەیەکی زۆر خۆیـەخۆیی هەستی پێ دەکرێ، واتە سەرەڕای چاودێری دەوڵەت لە پاراسـتنی دیمۆکراسـی و ئازادی و مافی مرۆڤ و سیستەمی عەلمانییەت، کولتـورێکی ئۆتـۆ-کـۆنترۆلیش

هەیە کە لەسەر ئاستی تاکەکەس و گروپ هەستی پیّ دەکریّ. ئیّمە مەبەستمان لە مەزنایەتی ئەمریکا ئەو سیستەمەیە کە لەگەلّ چەمکی مـرۆڤ دەگـونجیّ بـە مانا گەردوونیەکەی (Universel ) ، بـە پیّـچەوانەوە ئـەو دەولّەتانـە ئـەو سیفەتەیان نیە کە بە ماتۆڕیّکی ئیدیۆلۆژی ئیتر نایینی بن یان سیاسی حـوکمی مرۆڤ دەکەن. بیری میللی بە ڕاگوزاری بە تەنیشت ئەم دیاردەیـە تیّدەپـەڕیّ بـیّ ئەوەی هەستی پیّ بکا، بۆیە ئەفسانەی دەدەنە پالّ و دەلّـیّن زەڕقـاوی ئـەمریکا دروستی کرد هەر بۆ خۆشی کوشتی.

دواجار سیستەمیّکی لـەم جـۆرە، وەك نموونەیـەکی دیمۆکراسـی نـاویّزە لـە جیهان، بۆ خۆ پاراستن هەولّدەدا سنووری ئاسایشی خۆی هـەردەم دوور بخاتـەوە، هەروەکو ئەمڕۆ دەبینین سنووری ئاسایـشی ئـەمریکا لـە سـلیّمانی و هـەولیّر و بەغدان. بچووکترین جوولەی نارێك و مەترسی، کاریگەری بۆ سەر ئـەم سـنوورە دەبیّ. هەر لەبەر ئەمە لەو بڕوایەدام ئاسایشی ئیّرەش بەستراوەتەوە بە ئاسایشی ئەمریکا، ئەمەش واتە دریّژبوونەوەی سنووری دیمۆکراسی و ئازادی و سیستەمی عەلمانیەت و مافی مرۆڤ و ئاوەدانی تا دەڤەرەکەی ئیّمە. ئەمـەش واتـە هـاتنی بای دەولّەتی گەردوونی و ڕەوینەوەی دەولّـەتی ئیـدیۆلۆژی و فاشیـستی. ئینجـا کیّـشەکەی ئەمــسەر، یـان بیرکردنــەوە میللییــە ســەقەتەکەی ئیّــرە لیّــرەوە سەرهەلّدەدا، چونکە لەم چەمکە نوێیە ناگایە، چونکە هەمووی نوێیە بـۆ ئـەو. ئیّمـە زەمینـە و میّـژوویّکی دووروودریّـژمان لـەم بارەیـەوە نییـە، بـە کـورتی ئەزموونمان نییە و تازەکارین. لە لای مرۆڤی تازەکاریش بیرکردنەوەی میللییانـە گوڕ و تینی زیاترە لە بیرکردنەوەی سیـستەماتیك و تـەجریبی یـان بـە کـورتی عەقلانی. هەرلەبەر ئەمە زۆر بە سادەیی دەبینین و دەبیستین و دەلّیّن : ئەمریکا بۆ خۆی زەڕقاوی دروست کرد و هەر بۆ خۆیشی کوشـتی. ئەمـە پیّـی دەگـوتریّ مەنجەنیقی بیرکردنەوە، ئەمە پیّی دەگوتریّ بیرنەکردنەوە و تەمبەلّی و نەگەڕانەوە بۆ ڕەگ و ڕیشەی دیاردەکان. دواجار زەڕقاوی کوڕی فەلسەفەی سیاسی کویّرانەی وەهابیزمە، ئەو وەهابیزمەی کە سیّ سەد سالّە لە ناو ئیسلام سـەری هەلّـداوە و دەیەویّ جاریّکی دیکە ئەو ئیسلامە ئاسـاییەی میّـژوو هیّناویـەتی و ئـەوەکانی

پێش ئێمە ناسیویانە کە بە ڕای من زیاتر شێوەی داب و نەریتی وەرگرتووە لە ناو میللەتانی غەیرە عەرەب وەك لە ئایینێکی وشك و ڕەق، سەرلەنوێ بەرگێکی دیکەی عەرەبی لەبەر بکاتەوە، ئەمەش لە بنچینەدا ناسیۆنالیزمی عەرەبی نوێیە کە بە دوای ئاین و باوەڕێکی دیکە دەگەڕێ کە خۆی لەم بەناو بزووتنەوە ئیسلامییە پیشان دەداٰ کە بە زۆر شێوە خۆی پیشان دەدا وەك سەلەفییەکان و ئیخوانەکان و ....هتد ، کەڵە پیاوەکانیشیان بن لادن و زەرقاوی و ئەوانیترن. ئەم فەلسەفە سیاسییە کوێرانەی وەهابیزمە سەد ساڵە لە فۆڕمی ئیسلامی سعودی بە ناو جیهاندا بلاّو دەبێتەوە، دەمێکیشە لە کوردستان بوونیان هەیە. دواجار، نەخێر ئەمریکا زەرقاوی دروست نەکردووە بەڵکو ئەمە ناسیۆنالیزمی نوێی عەرەبی ئیسلامی وەهابییە کە دروستی کردووە و ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی کوشتییان.

# فەرهەنگی کوردی ستاندارد

... دەمێکە گفتوگۆیەکی پڕ لە دەمارگرژی لەبارەی زمانی ستانداردی کوردی لە میدیاکانی کوردی سەری هەڵداوە، هەڵبەت دەڵێم پڕ لە دەمارگرژی، چونکە ئەم دیاردەیە کێشەیەکی هەستیار و چارەنووس سازە بۆ کورد وەك نەتەوە و کولتور و زمان، واتە کێشەیەکە بیرکردنەوەیەکی زۆر مەوزوعیانەی دەوێ، دوور لە دەمارگرژی و ناوچەگەرێتی و دیالێکتگەرێتی، بەلاّم، ڕۆشنبیرانمان لە ڕوانگەیەکی زۆر زاتیانە باس لەم کێشەیە دەکەن و بە قەد ئاڵۆزی و گرینگی کێشەکە هەستیار و مەوزوعی نین. بێگومان هۆیەکەی دیارە و پێویست بە دەست هەڵبڕین ناکا. گۆشە نیگا و ڕوانینی تاکەکەس ئەگەر پشت ئەستور نەبێ بە لێکدانەوەیەکی دوور لە هەر جۆرە ڕەگەزپەرستیەکی ئەخلاقی، ناوچەگەری و زارپەرستی، دوو فلسی قەلپ ناهێنێ. لەوما، من لێرەوە بانگەشە بۆ هیچ ڕوانینێك و هیچ زارێك ناکەم، تەنیا ئەوەندە دەزانم کێشەیەکی ئاڵۆزمان هەیە و ڕوانینی خۆم بەوپەری هەستیارییەوە پیشان دەدەم، دەشێ سوودی هەبێ و دەشێ بە پێچەوانەوەبێ. سەرەتا بە پێوستی دەزانم ئاوڕێك لە ڕابردوو بدەمەوە، کورتەیەك لە بارەی مێژووی زمانی کوردی و سەردەمەکانی بخەمەڕوو، پاشان دەگەڕێمەوە سەر پێشنیارەکانی خۆم لە بارەی زمانی ستاندارد(زمانی یەکگرتوو). بێگومان هەموو میللەتێك دەبێ زمانێکی یەکگرتوو و پوختی هەبێ بۆ پەیوەندی کردن بە جیهان و پەیوەندییەکانی ناوەوەی خۆی. زۆر لە میللەتان دوچاری کێشەی لەم جۆرە بوونە و وێڕای سەرنێشەیەکی زۆریش توانیویانە بە سەریدا زاڵ بن و ببنە خاوەن زمانێکی ستاندارد، وەك تورکەکان و ئسرائیلییەکان و یۆنانیەکان و هەندێ لە میللەتانی سلاڤ و هیتر...هتد. ئەگەر سەرنجی مێژووی زمانی کوردی و بەکارهێنانی بدەین، دەبینین مەسەلەی زمانی بەکارهاتوو هەردەم لەگەڵ بووژانەوەی سیاسی و کۆمەلاّیەتی و شارستانی

گەشەی کردووە، لە هەر سەردەمێك زارێکی زمانی کوردی ئەم بووژانەوەی بە خۆیەوە بینیوە. لە سەدەکانی ناوەڕاست، بە تایبەتی لە سەردەمانی زووی ئیسلامی، زاری گۆران، پێش کرمانجی و سۆرانی گەشەی بە خۆیەوە بینیوە، ئەگەر هەڵە نەبم لە سەردەمی سەلجوقیەکان و زووتریش، ئەو سەردەمەی شاری (بەهار) کە ئێستا پاشماوەکانی دەکەوێتە باکوری هەمەدان، پایتەختی (کوردستان یان ویلایەتی ئەلجیبال) بوو، ئەوسا ئەو ناوەی هەبوو لە لای حوکمرانانی سەلجوقیەکان، زاری گۆران-ی و زارەکانی باشووری کوردستان لە بووژانەوە و بەکارهێنانی دەولەمەند بوون. ئەمڕۆ سەرەڕای مانەوەیان و درێژەدان بە خۆیان، لە ناو حاڵەتێکی لۆکاڵی زۆر تایبەت دەژین. ئێمە دەیان تێکستی ئەدەبی ئاینی ئەو سەردەمەمان بۆ ماوەتەوە، (کە زۆربەیان لە لایەن پرۆفیسۆر د. محەمەد موکری ساغ کراونەتەوە و لێکۆڵینەوەیان لە بارە کراوە)، بەلام لەگەڵ ڕووخان و نەمانی ئەو ئاوەدانیە سیاسی و شارستانیە بە گشتی لە باشووری کوردستان، بە تایبەتی لە ناوچەی ئیلامەوە بیگرە تا دەگاتە هەرێمی سۆران و موکریان، ئەو زارەش پووکاوەتەوە، بێگومان جەنگ و داگیرکردن بە پلەی یەکەم ڕۆلی سەرەکی هەبووە لەم پووکانەوە و لەناوچوونە، وەك هێرشەکانی تەیمورلەنگ و شالاوی مەغۆلەکان. بەلام ئەمە سەردەمێکی زۆر کۆنە و دەشێ بە یەکەمین سەردەمی زمانی کوردی لە قەلەم بدەین. دوای ئەمە (سەردەمی کۆنی ناوەڕاست) دێ، ئەمەش لەگەڵ هاتنی سەفەوی و عوسمانیەکان و شەڕ و شۆڕەکانی ئەمانە و تێوەگلانی کورد لە ناکۆکیە سیاسی و مەزهەبیەکانی ئەمانە دەست پێ دەکا، بەڵکو هێشتا کەمێك زووتریش. ئەم سەردەمە تا کۆتایی سەدەی هەژدە درێژە دەکێشێ. لەم سەردەمە زاری کرمانجی دەبێتە زمانحاڵی میرنشینە کوردییەکان، بە تایبەتی ئەو میرنشینانەی لەگەڵ سولتان سولەیمانی قانوونی پەیماننامەیان بە هاوکاری و ناوبژی ئیدریسی بەدلیسی لە ساڵی ١٥٣٢مۆر کردووە، تێیدا سەلتەنەتی عوسمانی بەرامبەر هاوکاری و پاراستنی سنووری ئیمپراتۆرِ دەستەلاتی کوردستان دەداتەوە کوردەکان خۆیان. هەمان پەیوەندی لە نێوان ئەردەلانیەکان و سەفەوییەکان هەبووە. جێگیربوونی ئەم پەیوەندییانەش ڕاستەوخۆ دوای شەڕی بەرگری قەلای دمدم بووە لە ساڵی

١٦٠٨، زاری ئەردەلانی کە ئەمڕۆ بە یەکێ لە بن زارەکانی سۆرانی لە قەڵەم دەدرێ، زارێکی لاواز بووە و تا ئەوسا شتێکی ئەوتۆی پێ نەنووسرابوو، بە پێچەوانەوە تا ئەو سەردەمە درەنگە هێشتا هەر زاری گۆرانی گوڕ و تینێکی زۆری هەبوو، ئەمەش تا سەردەمی مەولەوی و بێسارانی و خانای قوبادی درێژ دەبێتەوە، دواتر جۆرێك لە کپی تێدەکوێ. بەڵام لەم سەردەمە، واتە لە سەدەی شانزە و حەڤدە و هەژدە، کە ئێمە لە سەرەوە بە سەردەمی کۆنی ناوەڕاست لە قەڵەمماندا، هێز و گوڕ و تینێکی زۆر دەکەوێتە ناو زاری کرمانجی، لە سەردەمی (میرنشینی)حکومەتی کوردستان کە تاقە حوکمداری بوو لەو سەردەمە ئەو ناوەی هەبوو و پایتەختەکەی شاری بەدلیس بوو، وێڕای میرنشینی ئامێدی و بۆتان و هەکاری...هتد، لە پای ئەم بووژانەوە شارستانیەی ئەم هەرێمەی گرتبووەوە، زاری کرمانجی دەگاتە ئاستی زمانێکی پوختە و تۆکمە، بەرهەمی ناوێزەی ئەدەبی ئەم سەردەمە بریتیە لە کارەکانی فەقێی تەیران و ئەحمەدی خانیٚ وجەزیری و هیتریش. لەگەڵ پووکانەوەی ئەم بووژانەوە شارستانیەی باکوری کوردستان، بێگومان هۆکاری سیاسی خۆی لەپاڵ ئەم دیاردەیە بوو، دەبینین کە پێ دەنێینە سەدەی نۆزدەم ئەمارەتەکانی باکور نەماون، (تەنیا دەستەڵاتی بەدرخانیەکان تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم درێژ دەبێتەوە) سەرەنجام زاری کرمانجیش دەکەوێتە ناو پووکانەوەیەکی ڕۆشنبیری. بەڵام دیسان، هەر بە هۆی جۆرێك لە نوێبوونەوە لە پەیوەندیە سیاسیەکانی جیهان، سەردەمێکی نوێ لە ئێران و ناو دەوڵەتی عوسمانی و ڕوسیا و پەیوەندی ئەمانە بە ڕۆژئاوا، سەرهەڵدەدا. وێڕای لاوازبوونی دەستەڵاتەکانی باکوری کورستان، لە شوێنێکی تر ، لە هەرێمی ئەردلان و بابان و سۆران، ناوکێکی دیکەی دەستەڵاتی کوردی سەرهەڵدەدا، بێگومان ئەمانەش هەر درێژبووەوەی دەستەڵاتی سیاسی کوردی پێشووە، دروست کردنی شاری سلێمانی و سەرهەڵدانی باوەڕی ئاینی خالیدی نەقشبەندی، وەك ئەنجامێکی کوردی، یان بەشداری کردنی کوردی ئەو سەردەمە سەیر دەکرێ لەم نوێبوونەوە جیهانیە، کە دواتر ورده ورده، لە سەردەمی نوێ لەگەڵ بزووتنەوەی ئەهریەکان و ڕاپەڕینەکانی تری باکور و باشور و شۆڕشەکانی بارزانی تێکدەکەنەوە و شێوە و ناوەڕۆکی کوردایەتی و خەباتی ئەتەوایەتی و

میللی کوردی وەردەگرێ. لەگەڵ ئەم فۆڕمە نوێیە و ئەم بەشدارییە نوێیە کە سەرچاوەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەردەلان و بابان و سۆران، زاری ئەم هەرێمانە بووژانەوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش بە خۆیەوە دەبینێ، ئەمەش لەگەڵ کارەکانی نالی و کوردی و حاجی قادر دەگاتە ئەوپەڕی بە هێزی و تۆکمەیی. بەلاّم لەگەڵ ڕیفۆرمی تەنزیماتی عوسمانی کە لە ساڵی ١٨٣٩ دەست پێ دەکا و لە ١٨٨٧ کۆتایی پێ دێ، ئەم دەستەلاّتانەش لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم دەڕووخێن. جارێکی دیکەش پووکانەوەی سیاسی پووکانەوەی زمانەوانی بە دوای خۆیدا دەهێنێ. دواجار، لەگەڵ دروستبوون و سەرهەڵدانی نوخبەی ڕۆشنبیری کوردی نوێ، بە تایبەتی ڕۆشنبیرانی ناسراو بە گروپی ئەستەنبۆل، لە پاڵ هێزی ڕیفۆرمخواز و هێزی دەستوری (مەشروتە) کۆتایی سەدەی نۆزدە تا سەرەتای سەدەی بیستی ئەستەنبۆل، ڕۆشنبیری کوردی جارێکی دیکە دەکەوێتە ناو بزووتنەوە و بووژانەوەیەکی زمانەوانی بە تایبەتی و فەرهەنگی و سیاسی بە گشتی. لێرەشەوە زاری کارپێکراو و بەکارهاتوو زاری کرمانجییە، بەلاّم لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوە و هێرشی ناسیۆنالیزم، بە تایبەتی هێرشی ناسیۆنالیزمی نەژادپەرست کە خۆی لە ئیدیۆلۆژی ئیتیحاد و تەرەقی و کەمالیزم و تۆرانیزم بەرجەستە دەکرد، لەگەڵ ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و دامەزراندنی دەوڵەتی تورکیا لە ١٩٢٣ ، ڕاوەدوونان و سەرکوتکردن و لەناوبردنی ڕۆشنبیرانی کورد دەستی پێکرد، جارێکی دیکە پووکانەوە و نشووستی سیاسی، نشووستی و پووکانەوەی زمانەوانی بە تایبەتی و فەرهەنگی بە گشتی بە دوای خۆیەوە دەهێنێ. جارێکی دیکە زاری کرمانجی دەکەوێتەوە ناو بە کارنەهێنان و لاوازی، ئەمەش تا ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەم درێژەی دەبێ، پاشان لە لایەن دیاسپۆڕای کوردی باکور لە ئۆڕوپا جارێکی دیکە وردە وردە دەبووژێتەوە.

دوای ئەمانی ئەزموونی ئەستەنبۆل، ڕاستەوخۆ بووژانەوەی سیاسی و فەرهەنگی دەگەڕێتەوە هەرێمی ئەردەلان و بابان و سۆران، ئیتر ئەم جارەیان سەرەڕای کێشە و ئاڵۆزی سیاسی بەردەوام، بەلاّم سۆرانی (کرمانجی ناوەڕاست) لە سەر هەمان گوڕ و تینی سەدەی نۆزدەم درێژە بە خۆی دەدا تا دەگاتە ئەمڕۆ کە بەندە ئەم نووسینەی بەم زارە نووسیوە. بێگومان، بە بەراورد لەگەڵ زمانی

نالی و حاجی قادر، گۆران و پێشکەوتنی زۆری بە خۆیەوە بینیـوە. ئیمـڕۆ زاری گۆران و کرمانجی و لەك و لوڕ لە چاو سۆرانی کەمتر لە بواری فەرمی و نافەرمی و نووسین و میـدیا و تـا رادەیـەکی زۆریـش لـە بـواری بیرکردنـەوەی تیـۆری و ئەبستراکت کاری پێ کـراوە، سـۆرانی لـەم ڕووەوە، وێـڕای سـوود وەرگـرتن لـە زارەکانی تر زۆر هەڵکشاوە و زۆر گەشەی کردووە، بە ڕادەیەك پاشەکـشە کـردن دەبێتە خەتەرێکی مەزن لە سەری. بەلاّم هەڵبژاردنی زارێك کێشەیەکی سیاسی و شارستانی سەختە بۆ کورد، بە ڕای من، دەستەلاّتی سیاسـی دەبـێ لـەم ڕووەوە هەنگاوی پراتیك بهاوێژێ، پێش هەموو شتێك، پێویسته دەسـتەلاّت وشـەگەلی (سۆرانی) (بادینی) ...هتد، لە چوارچێوەی گفتوگۆ و نووسین لەم بارەیەوە، واتە لە بواری بە ستاندارد کردنی زمانی کوردی قەدەغە بکا، تەنیا باس لـە زمـانی کـوردی بکـرێ. دەشـێ حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان پرۆسـە و پلانێکـی سەرتاپاگیری دارێژێ، کار بۆ فەرهەنگێکی ستانداردی کوردی بکرێ، هەڵبەت بە فۆرمی جیاجیا، گەورە و ناوەنـدی و بـچووك، بـە سـوود وەرگـرتن لـە فـۆڕمی بنچینەیی گرامەتیکی زارەکان، بـە تایبـەتی بنـچینەی گرامـەتیکی سـۆرانی، هەموو زارەکانی زمانی کوردی بخرێتە ناو ئەم فەرهەنگـە، لێـرەش مەبەسـتمان موفرەدە و دەسـتەواژەکان و بـە کارهێنانـە جۆراجۆرەکانـە. لـە هـەمان کـات، پێویستە ئەم فەرهەنگە بە دوو ئەلف و بێ بێ، ئەلف و بێی ئەم نووسینە و ئەلف و بێی لاتینی. ئەمەش وادەکا زمانی کوردی هەنگاوێکی مەزن بهاوێـژێ و لـەو گرفتە گەورەیە دەرچێ هەرکەس بـە ئـارەزووی خـۆی یـاری پـێ بکـا. چـونکە هەروەکو لە سەروە بینیمان، هۆکاری سیاسی، یان هۆکاری مەوزوعی لە پاڵ ئەم حاڵەتەی ئەمڕۆی زمانی کوردییە، لەبەر ئەوە هەر دەبێ بە پـلان و پرۆسـەیەکی مەوزوعی، یان چارەسەرێکی سیاسی ڕۆشنبیری زمانەوانی لـەم گرفتـە ڕزگـاری بێ.

## ئەدەبی بەراوردکاری

ئەدەبی بەراوردکاری بوارێکی زانستی ئەدەبی نوێیە. لەوانەیە لە هەموو بوارەکان گرینگتر بێ. بەو مانایەی باس لە دیاردەیەك دەکا پەیوەندی بە ژیانی ڕۆشنبیری و کولتوری میللەتانەوە هەیە. لێرەشەوە وەك کێشەیەکی مرۆڤ یان مرۆڤایەتی خۆی ڕەپێش دەکا کە پێویستی بە ناساندن و دیاری کردنی سنوورەکانی ئەم زانستەوە هەیە.

مانای یەکەمی ئەدەبی بەراوردکاری زیاتر ئەو لایەنە دەگرێتەوە کە پەیوەندی بە یەك گەیشتنی ئەدەبەکانەوە هەیە. ئەمەش بریتییە لە بە یەك گەیشتنێکی ئاڵۆز کە مێژووی تایبەتی خۆی هەیە. بە پێی جۆرەکانی ئەدەب و ڕێبازەکان و بزووتنەوە فیکرییەکان و کەسەکان و میللەتان دەگۆڕێ. لەم ڕووەوە دەبێ حسێبی دوو شت یان دوو لایەن بکەین: یەك پەیوەندی بە ئایدیاکانەوە هەیە، دووەم پەیوەندی بە شێوازەوە هەیە.

ئەدەبی بەراوردکاری هەر تەنیا وەك مێتۆدێك خۆی لە بواری ئەدەب قەتیس ناکا بەڵکو بەرەو بوارەکانی تری شارستانی دەڕوا و پەیوەندی بە بە یەك گەیشتنی مرۆڤە جیاوازەکانەوە هەیە.

سنوورەکانی ئەدەبی بەراوردکاری لە ڕووی تەکنیکییەوە بە زمان لێك جیادەکرێتەوە، ئەو ئەدەبەی بە کوردی دەنووسرێ بە ئەدەبێکی کوردی لە قەڵەم دەدرێ ئەگەر نووسەرەکەی خۆی کوردیش نەبێ.

ئەدەبی بەراوردکاری بابەتێکی جەوهەرییە بۆ مێژووی ئەدەب، چونکە لە ڕێگای ئەم بوارەوە دەتوانین بە دوای سەرچاوەکانی ئەدەبی نەتەوایەتی میللەتێك و بزووتنەوە ئەدەبی و فیکری و فەرهەنگییەکان (مەبەستمان لە میللەت

نەتەوەیە) بگەڕێن و بیاندۆزینەوە. چونکە هەموو نەتەوەیەك لە مێـژووی خـۆی، لە گەشەسەندنی ئەدەبیاتی و داهێنانە مەزنەکانی بێ هیچ گومانێك کەوتۆتە ژێر کاریگەری میللەتانی تر، سەرەتا هەرە نزیکەکان لێی، ئینجا هەرە دوورەکان.

ئەدەبی بەراوردکاری، وەك زاراوە، بە ڕای زۆر لە ڕەخنەگران ڕوون نیـە، دەکـرا ناوی (مێـژووی بـەراوردکاری ئەدەبـەکان) بوایـە، یـان (مێـژووی بـەراوردکاری ئەدەبیات) بەڵام لەوەتەی ڕەخنەگری فرەنسی سـان بـۆڤ Saint-Beuve لـە زاراوەی (ئـــەدەبی بـــەراوردکاری Littérature comparée)کـــورتی کردۆتەوە، ئیتر لەوساوە وەك دەستەواژە بـۆ مێتـۆدێکی دیـاری کـراوی ئـەدەبی گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە.

ئەدەبی بەراوردکاری وەك مێتۆدێکی زۆر گونجاویش بە کـاردێ دژی دیـاردەی (دزینی ئەدەبی و فیکری و هونەری)، لێرەوە ڕەسەنایەتی و ئـەدەبی ڕەسـەن بـە دەردەکەوێ و ڕاستەوخۆ هەستی پێ دەکرێ.

هەر دەربارەی پێناسـە و سـەرەتاکانی ئـەدەبی بـەراوردکاری، لێکۆڵـەرەوەی فرەنسی ژان ژاك ئەمپییێر دەڵێ : (لەمەودوا گرینگـی بـە ئـەدەبی بـەراوردکاری دەدەین، چونکە بێ ئەمە مێژووی ئەدەب تەواو نابێ. )

کە دەربارەی ئەدەبی بەراورداری و سنوورەکانی وەك مێتۆدێك دەدوێـین، دەبـێ باس لە کاریگەری ڕاستەوخۆ و بەرجەستە بکەین، نەك تەنیا پێکچوونی سـادە و ساکار. چونکە هەندێ جار لە نێوان دوو نووسەر یان شاعیر پێکچوونی زۆر هەیە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیـەنێ کەوتبنـە ژێـر کاریگـەری یـەکتر. بـۆ نموونـە نووسەری ناسراوی فرەنسی ستەندال کتێبێکـی لـە بـارەی (شکـسپیر و ڕاسـین ) هەیە، ئێمە دەزانین ئەم دوو نووسەرە هەر یەکەیان لە سەردەمێکی جیاواز ژیاون، لە نێوان ئەم دووە هیچ پەیوەندییەك نیە، بەڵام دواتر تێدەگەین کە ستەندال ئـەم کتێبەی بەم چەشنە نووسیوە و ڕاسینی بە شکسپیر بەراورد کردووە، زیـاتر بـۆ ئەوە بووە لە مەسەلەی تێگەیشتن لە ڕۆمانسیزم ڕوانینی ئەم دوو شاعیرە بزانـێ، ستەندال لێرەوە ڕاسن لە ڕیزی ئـەو شـاعیرانە دادەنـێ کـە ئیلتیـزام بـە یاسـاو ڕێساکان دەکا، هەرچی شکسپیرە، بە پێچەوانەوەیە. یان دوو شاعیری وەك جـۆن

میلتن -John Milton و ئەبو عەلای مەعەڕی، لەبەر ئەوەی هەردووکیان نابینا بوون و لە هەمان کات دژی ئاین بوون، وەك پێکچوونێك، ناشێ ببێتە زەمینەیەك بۆ ئەدەبی بەراوردکاری.

لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بەراوردکاری، پشت بە پێکچوون و وێکچوون نابەستێ، بەڵکو پشت بە بەڵگەو و دەستاوێژی کاریگەری و مێژووی ئەم کاریگەری بوونە بە شێوەیەکی بەرجەستە دەبەستێ. نەبوونی ئەم لایەنە لە نێوان دوو ئەدەب، باشترە ئەم لایەنە لە بیر بکرێ. بۆ نموونە ئێمە هیچ زەمینەیەکمان نیە لەسەری بووەستین لە نێوان ئەدەبی کوردی و ئەدەبی ژاپۆنی. بۆیە ناشێ و ناگونجێ بە دوای کاریگەری و پەیوەندی بگەڕێین.

ئەدەبی بەراوردکاری لە ناو یەك ئەدەبی نەتەوایەتیش بوونێکی نیە. بێگومان دەشێ نووسەرێکی ئەمڕۆ یان شاعیرێك بکەوێتە ژێر کاریگەری نووسەر یان شاعیرێکی کۆن، بەڵام ئەم بوارە پەیوەندی بە ڕەخنەو و لێکۆڵینەوەی ڕەخنەییەوە هەیە لە ناو ئەدەبی نەتەوایەتی ئەو میللەتە.

پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە هەر جۆر و شێوەیەك بێ، کە بەردی بناغەی ئەدەبی بەراوردداردکارییە، بە پێی کەسایەتی ڕۆشنبیری و شیکردنەوە و ڕوانینی ئەو کەسە دەگۆڕێ. بۆ نموونە، نووسەری ئینگلیزی تۆماس کاریل (١٧٩٥ - ١٨٨١) کە بەرهەمەکانی نووسەر و شاعیری ئەڵمانی گۆتە -Goethe (١٧٤٩-١٨٣٢) دەخوێنێتەوە، تێیدا لایەنی ساتیریك و ڕەخنە و دژایەتی کردنی ئایینی لێ بە هەند وەرناگرێ، تەنیا ئەوە دەبینێ لە بەرهەمەکانی گۆتە کە لەگەڵ چەشە و پەروەردەی ئایینی و کۆمەڵایەتی خۆی دەگونجێ، گۆتە بە شاعیرێکی ڕاستگۆ و سەر ڕاست و لە خزمەتی کۆمەڵانی خەڵك دەبینێ. لە یەکێ لە گەشتەکانی خۆی بۆ ئەڵمانیا بەم جۆرە باس لە گۆتە دەکا : دەڵێن گۆتە ڤۆلتێری ئەڵمانیایە، بەڵام ئەمە ڕاست نیە، هەتا ئەگەر ئەمە ڕاستیش بێ، بە ڕای من گۆتە لە ڕیزی ئەو پیاوە باڵایانەیە قەت وەك ئەو منداڵە بە نازە نیە کە لە جیهانێکی پڕ لە فەسادی دەژی و فەساد بووە کە ڤۆلتێرە. گۆتە نە مرۆڤێکی گوماندار بووە نە کەسێکی دەم پیس، بەڵام مامۆستایەك بووە تەنیا ڕاستی گوتووە. گۆتە

ڕووخێنەر نەبووە، بەڵکو بنیاتنەر، تەنیا بیرمەندێك نەبووە، بەڵکو حەکیمێکیش بووە. ) ئەم ڕوانینەی کاریل لە نـاو ئینگلیزەکـان کاریگـەری سـەدایەکی زۆری هەبوو، لەم سۆنگەیەوە زۆر لە شاعیران و نووسـەرانی ئینگلیـز کەوتبوونـە ژێـر کاریگەری گۆتـە، بـە تایبـەتی کەوتبوونـە ژێـر کاریگـەری چـیرۆکی (ڤیلـهێلم مێیستەر Wilhelme Meister) . بە گشتی ئـەدەبی ڕۆمانـسی ئـەڵمانی کاریگەری لەسەر ئەدەبی فرەنسی و ئینگلیزی و ئیتالی و هی دیکەش داناوە، بە تایبەتی لە سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم.

بێگومان کەوتنە ژێر کاریگـەری ئـەدەبێکی تـری جیـاواز یـەکێ لـە لایەنـە گرینگەکانە، ئەمەیان وەك خۆراکێك وایە، هەموو دەبـێ لێـی سـوود وەرگـرن، بـەڵام ئەمـە دەبـێ لـە ڕووی بەرهـەم هێنانـەوە هـەمان ڕەسـەنایەتی تێـدابێ، پێچەوانەی ئەمە، لە بێ مانایی و سادە وساکاری زیاتر نیە.

کەواتە ئەدەبی بەراوردکاری، بوارێکی لێکۆڵینەوەیە، گرینگی بـەو پەیوەنـدی و کاریگەرییانە دەدا کە لە نێوان ئەدەبەکاندا هەیە، شیکردنەوەی ئەم پەیوەنـدی و کاریگەرییانـە. هـەروەها هۆیەکیـشە بـۆ ئـەوەی ئـەدەبی نەتەوایـەتی لـە نـاو دوورەپەرێزی خۆی دەرچێ و دەرگاکانی بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەویش بە هی بەشـێك لە جیهاندا دابنرێ.

## ئاخاوتنی جەنابی بێرنارد کوشنەر
## وەزیری کاروباری دەرەوە ی فرەنسا و ئۆرۆپا
## لە رۆژی ٢٠٠٨/٦/١ لە کاتی کردنەوەی کۆنسولگەری فرەنسا لە هەولێر.

هەردەم لە کاتی پێشکەکردنی ئاخاوتنی لەم جۆرە بەوە دەست پێ دەکەین بلێین زۆر بەختەوەرین لێرە، بە ڕاستیش وایە، زۆر بەختەوەرم لێرەم. وا هەست دەکەم، بالیۆزی فرەنسا و فرێدریك تیسۆ و هەموو ئەو فرەنسییانەی لێرەن زۆر بەختەوەرن لە مەراسیمی کردنەوەی بیرۆی بالیۆزخانەی فرەنسا لە هەولێر کە دەبێتە کۆنسولگەری فرەنسی.

بەختەوەرم لێرەم لە هەولێر، پایتەختی هەرێمی کوردستانی عێراق. زۆر لە پێکهاتەکانی ئەم مێژووەم بیردێتەوە، بە تایبەتی ئەو مێژووەی کە پەیوەندی بە گەلێك کەسەوە هەیە لێرە، بە تایبەتی بە مرۆڤێکی مەزنەوە، بە خانوادەی بارزانی، بە خەباتی کورد. کەمێك پێش ئێستا کە وێنەی مستەفا بارزانی ـم بینی کە دەکاتە باپیری سەرۆك وەزیران، ئەو ئێوارەیەم بیرکەوتەوە، ئەو شەوەی ساڵی ١٩٧٤، وابزانم لە مانگی سێپتەمبەر بوو، ساڵی ١٩٧٤ بۆ یەکەمین جار چاوم بەو مرۆڤە مەزنە : مستەفا بارزانی، پاشان چاوم بە هەموو خانەوادەکەیان کەوت، لەو کاتەوە ئەم پەیوەندییە چەندان ساڵی کێشاوە و بەردەوام بووە، چاوم بە ئیدریس کەوت، پاشان مەسعود، ئێستاش سەرۆك وەزیران جەنابی نێچیرڤان بارزانی. ئەمدەزانی دوای نزیکەی چل ساڵ، هەندێ کەس، لەوانە فرێدریك و ئالان دێلۆش و کەسانی دیکە ڕۆژێك دادێت لێرە لە چاوەروانیماندان.

ئەم ڕۆژە، تایبەتــە بــە گــەلی کــورد و پەیوەنــدی بــەوەوە هەیــە، بــەڵێ بــە کوردەکــان، بــەڵام پەیوەنــدی بــە عێراقیــشەوە هەیــە، پەیوەنــدی بــە هــەموو عێراقیەکانەوە هەیە، چونکە واهەست دەکەم، بە پێی هەندێك هۆ و لێکدانەوەی خۆم کە ڕێگام پێ نادا هەڵە بکەم، مێژووی کورد پێشەنگە بۆ مێــژووی عێــراق، خەباتی کورد بۆ ئازادی بوو، بۆ دەرچــوون بــوو لــە بــن دەســتی دیکتــاتۆر، بــۆ دروستکردنی مۆدێلێك بوو لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست. (چەپڵە)

هەروەها ئەوەشم بە بیردێتەوە، چونکە لە پەرلەمان بــووم، لەگــەڵ ســەرۆکی پەرلەمان، لەگەڵ ئێوە هەمووتان، ئەندامانی ئازیزی پەرلەمان، بە بیرم دێتــەوە، چونکە لە کاتی کردنەوەی پەرلەمان لە ساڵی ١٩٩٢ لە تەنیشت دانیال میتێران بووم لە ناو پەرلەمان، ئەو ساتە فرمێسك لە ناو دەنگمان قەتیس بــوو بــوو کــە گوێمان لە یەکەم ئاخاوتنی ئــەم پەرلەمانــە ئــازادە گــرت، بێگومــان دوای ئــەو هەموو ساڵانەی خەبات. ئێستاش بیرم بۆ دانیال میتێران دەچێ، بیرم بۆ فرانسوا میتێران دەچێ، (چەپڵە) کــە ســەرەڕای هــەموو گرفتێکــی ئــەو ســەردەمە لــە تێگەیشتنی لە کێشەی کورد، زۆر یارمەتی ئێمەی دا. لە سەردەمی زۆر پڕ لــە کێشەش یارمەتی زۆری کوردی دا، چونکە کە مــن دەڵــێم کــورد پێــشەنگن بــۆ خەباتی هەموو عێراق، بــە داخــەوە کوردەکــان لــە دژی یــەکتریش بــۆ هــەموو عێراقیەکان پێشەنگ بوون، لە دژی یەکتر شەڕیان کــرد. بــەڵام ئەمــە هــەمووی کۆتایی هات، خۆشبەختانە ئەو کۆبوونەوەی ( رامبوویێ ) کە هەر بە یارمــەتی فرانسوا میتێران بوو کە دەرگای گفتوگۆی لە نێوان ئــەم دوو بــرا دژ بــە یەکــەی کردەوە کە جەلال تاڵەبانی مەسعود بارزانی بوون، دواتر بوونــەوە بــرای جــارانی هەمیشەیی.

هەموو ئەمانە رابردوون، هــەموو ئەمانــە هــیچ نــین بەرامبــەر بــە دوارۆژی عێراقیەکان کە چاوەڕێتان دەکەن.

بەڵام پێش ئەوەی باسی ئایندە بکەم، دەمەوێ دوو وشە لە بــارەی چــاوپێکەوتنم لەگەڵ جەلال تاڵەبانی بدرکێنم، ماوەیەکی زۆر بەســەر ئــەم دیــدارەم تێپــەڕیوە، چونکە عەبدولرەحمان قاسملو-شی لەگەڵ بوو. قاسملو، ئــەو مرۆڤــەی لــە ڤیــەننا

تیرۆر کرا، ئەو مرۆڤەی کە سەرەڕای هەموو زەحمەتیەکی پارچە پارچە بوونی ولاتەکەی لەنێوان کومەڵێك ولات سەرپەرشتی خەباتی گەلی کوردی دەکرد، بە یەکەوە، لە ناو یەکێتی بیری دیمۆکراسی خەباتی دەکرد کە پێویستییەکی زۆر بوو.... ئینجا دیدارم لەگەڵ جەلال تالەبانی کە لە زۆرێك لە خەباتە جیهانیەکان دەردەچوو، کە لە لوبنان دەردەچوو، کە ئێمەش لەگەڵ سەرۆك وەزیران لە لوبنان قسەمان دەکرد... هەموو ئەمانە زۆر سەختە گێڕانەوەیان بۆ نەوەی نوێ، کە ئایندەی ئەم عێراقەن و ئایندەی ئەم هەرێمەی کوردستانن.

دەمەوێ ڕێز و شایان لە هەموو ئەو کەسانە بنێم، ئەو خەباتگێڕانە، پێش هەموو کەسێك چالاکڤانانی مافەکانی مرۆڤ، سەرۆك تالەبانی، سەرۆك بارزانی، هەموو ئەوانی پێش ئەوان خەباتیان دەکرد، ئەوانەش کە بە دوایان دادێن و سبەی کوردستان ئاوەدان دەکەنەوە، ئەم هەرێمەی کوردستان کە دەبێتە هۆی یەکگرتوویی عێراقی ئاینده.

سوپاس بۆ هەمووتان.

ئێستاش فەرموو لەگەڵ کردنەوەی نوێنەرایەتی دیپلۆماسی ئێمە، دڵنیاتان دەکەمەوە خێراو بەم زووانە دەبێتە کونسولگەری فرەنسی. دەمەوێ ئارەزووی قووڵی فرەنساتان پێ ڕابگەیەنم کە ئامادەبوون و یارمەتیدەربێ لە بنیاتنانی پرۆسەی سیاسی و هاوسەنگی هەموو عێراق، لەو بنیاتنانەوە پێویستەی هەموو عێراق لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، بە هەموو کێشەو گیروگرفتەکانی لە مێژووی ئەمرۆی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست.

ئێوە کوردەکان، عێراقیەکان، ڕۆلێکی گرینگتان لە پێشە بیگێڕن لەو مێژووەی کە هەر ئەمڕۆ لە پێشتان دەنووسرێتەوە. ئێمە پێویستیمان بە ئێوە هەیە. پێویستیمان بە کوردستانێکی بەهێز هەیە لە ناو عێراقێکی ئازاد و دیموکرات، لە ناو عێراقێك کە هەموو بەرپرسیارییەك هەڵبگرێ، هەموو بەرپرسیارییەك، تا چیتر پێویستی بە کەس نەمێنێ.

بەلاّم بە ئێوە، هەردەم پێویستی پێ دەبێ. ئێوە مۆدێلی پێشکەوتووی عێراقن. (چەپڵە)

دوێنێ لە باشوور بووم، لە ناسرییە، بینیم لەوێش هەلکەوتێکی تایبەتی هەیە دەیەوێ خۆی بنوێنێ. دەزانم لە بەغداش رەوشەکە لە بارترە. هێشتاش تیرۆر، تەقینەوە ماوە، بەلاّم سەیرکەن، لەبەر ئەوەی ئێوە سەری رمەکەن: پێشەنگن، مێژووی پێشکەوتووی عێراقن... تەقینەوە لە لای ئێوە نەماوە، هاوسەنگی هەیە، ئارەزوو و شادی بۆ ژیان هەیە، بنیاتنانەوە هەیە.

بژی کورد کە پێشەنگی عێراقە، هەر بژین هەمووتان. (چەپڵە)

دەشێ بەرەو پێشەوە برۆین. ئێوەش لەسەر داواکانی خۆتان پێداگرن. لەسەر رۆلی پەرلەمان پێداگرن بۆ ئەوەی کاریگەری خۆی بنوێنێ، لێرەشەوە وەك مۆدێلێك بۆ رۆلی پەرلەمانی عێراقی داواکاریتان هەبێ، پێداگری بکەن لە خەباتتان بۆ مافەکانی مرۆڤ، بۆ مافەکانی ژنان، ئەوانەی عێراقی سبەینێ دروست دەکەن، پێداگری بکەن لەسەر ئەوەی پرێس و رۆژنامەوانیتان ئازاد بێ، بۆ ئەوەی لەم رووەشەوە ببنە پێشەنگ بۆ رۆژنامەوانی عێراقی ئازاد. ئێوە مێژوویێکی بێ وێنەتان لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاست لە پێشە. لەبەر ئەوە دەبینم ئەم رۆژە کە بۆ ئێمە زۆر ورووژێنەرە، لە هەمان کات رۆژێکی مێژوویشە. بێگومان ئاسانە بلێین دەتوانین مێژوو دروست دەکەین. بەلاّم ئێوە مێژووتان دروست کرد.

سەرەنجام دوا وشەم تایبەتە بە پەیوەندی نێوان کورد و فەرەنسا، عێراق و فرەنسا.

ئێمە دەمێکە هاوڕێی یەکترین. لە گەلێك رێگاوە بە یەك گەیشتووین. هەندێکمان، لە زووێکەوە، بێگومان نە بالیۆزی ئێستا، نە کۆنسولی ئەمڕۆ بووین، هەلّبەت کۆنسولی ئایندەین... فرێدریك تیسۆ هەر تەنیا کۆنسول نەبووە، ئەو خەباتگێڕێك بووە، چالاکڤانێك بووە، مرۆڤێکی نایاسایی قاچاخ بووە ! (چەپڵە).

ئێوەش نایاسایی و قاچاخ بوونە، تیسۆ و ئالان و بەندەشتان هەروابووە، ئەمانە بوونە کە هەندێ جار یاساکانیان گۆڕیوە. ئینجا دوای ئەوەی قاچاخ و نایاسایی بووینە، هەر ئەمانە بوونەتە نوێنەری یاسا و یەکسانی. هەر ئەمەشە کە گەلی گورد کردوویەتی. (چەپڵە).

ئێوه ماوەیەکی زۆر ناپاسایی بوون، بەلام ئەمڕۆ یاسایین. ئێوه ئایندەن. لێرەشەوە پێویستە ببنە مۆدێلی مافی مرۆڤ و دیمۆکراسی. (چەپڵە).

سەرەنجام فرەنسا لەگەڵ ئێوەیە،، ئەمەتە لێرەیە. فرەنسا بە هۆی ئەم بیرۆیە کە دەبێتە کۆنسولگەری ئێمە، ڕێگاتان پێ دەدا سەفەر بکەن بەرەو ئێمە، ئێمەش بەرەو ئێوە، هیوادارم ئەو فرەنسییانەی لێرەن تێبگەن بۆچی "کە دەزانم دەمێکە تێگەیشتوون" زۆر گرنگە هەر یەکێك لە ئێمە ببێتە پەیامبەری ئەم هەرێمەی کوردستانی عێراق، ئەم هەرێمەی عێراق بۆ کۆمپانیا فرەنسییەکان، بۆ برایەتی فرەنسییەکان لە نێوان عێراقیەکان، لە نێوان کورد و فرەنسییەکان.

فرەنسی زۆرمان دەوێ لێرە ئامادەبن، بەکارهێنانی وزەی زۆرمان دەوێ. ئێوە بێگومان مۆدێلن، ئەم وشەیەم زۆر دووبارە کردەوە لە ئاخاوتنەکەم، هەڵبەت، ئێوە پێشەنگن. سەرنجام لە نێوان پێشەنگەکان، لە نێوان ئەو فرەنسیانەی لێرەن، لە نێوان فرەنسا و هاوڕێیانی کوردی عێراقمان، پێوستە پەیوەندیەکی خەستی ئابووری، وەبەرهێنان، هەروەها کولتووری هەبێ.

دواجار، سوپاسی سەرۆك وەزیران (جەنابی نێچیرڤان بارزانی) و سەرۆك بارزانی دەکەم. ئێوە زۆر خێرا بوون و دەست وبردتان کرد لە دابین کردنی ئەم خانووە جوانە زۆر سپیە کە دەبێتە بیرۆی هەولێری باڵیۆزخانەی فرەنسی لە کوردستان، کە دەبێتە کۆنسولگەری فرەنسی لە هەولێر، نەك هەر ئەمە، بەلکو ئەم باڵاخانەی تەنیشتیشی دەبێتە "سەنتەری کولتووری فرەنسی"، سوپاس بۆ سەرۆك وەزیران، سوپاس بۆ وەزیری دارایی، کە ئەمەی قبول کرد، سوپاس بۆ بەرپرسی پەیوندییە دەرەکیەکانی هەرێم، سوپاس بۆ هەمووتان، فەرموو ئەمەش یەکەمین سەنتەری کولتووری فرەنسی لە هەولێر و لە کوردستان، راستەوخۆ لە تەنیشت کۆنسولگەری.

وێڕای سوپاس کردن کۆتایی بە قسەکانم دەهێنم، پەلەمە گوێ لە نوێنەری فەرمی کورد بگرم، ئەو گەلەی زۆرم خۆشدەوێ، کە زۆر خۆشمان دەوێ.

من تاقە کەسی دیپلۆماتی خۆمتانم داونەتێ کە کوردی دەزانێ، ئێوە دەزانن کە فرێدریك تیسۆ کوردی دەزانێ؟ (چەپڵە) ئیتر ناوە ناوە کەسانێك دەنێرین کە

شایانی ئەم کارەن، ناسانە، کەسانێك دەست نیشان دەکەین کە شارەزاییان هەیە، ئەمەش ناسانە، بەلاّم کە شارەزاییان هەیە و زمانی ئەو شوێنە دەدوێن و گونجاون، مەسەلەکە هیچ پەیوەندی بەوەوە نیە کە .... وەك نەریت فرەنسییەکان کاری لەم جۆرە ناکەن، بەلاّم دەشیکەن.

دواجار، سوپاس بۆ هەموو لایەك، سوپاس بۆ سەرۆك وەزیران، سوپاس بۆ سەرۆك بارزانی، سوپاس بۆ بالّیۆزمان کە زۆر بە رێك و پێکی کارەکانی جێ بە جێ کردووە، بە ناوی هەموو ئەوانەی لێرە ناوم هێنان، لەگەلّ ئەمەش مافی ئەوەم نیە بە ناوی خانوادەی بارزانی قسە بکەم لە کاتێکدا باشترین نوێنەریان لێرە ئامادەیە، بە ناوی هەموو ئەم خەلّکە، هەموو خەباتیان، هەموو پێداگری بەردەوامبوونیان، زیرەکیان، چالاکیان، بە تایبەتیش بە ناوی ئازایەتی گەلی کورد، سوپاس بۆ رێگادانتان بۆ کردنەوەی ئەم بیرۆیە کە دبێتە کلیلی پەیوەندی زۆر بەهێزتر لە نێوان کورد و فرەنسییەکان، لە نێوان عێراقیەکان و فرەنسییەکان. سوپاس. (چەپلە).

دوای ئاخاوتنی سەرۆك وەزیران جەنابی نێچیرڤان بارزانی، بەرێز بیرنارد کوشنەر جارێکی دیکە ئەم لێدوانەی دا:

( ئەوەی دەیکەم بە هیچ شێوەیەك دیپلۆماسی نیە، بە هیچ شێوەیەك یاسایی نیە. دەمەوێ بلّێم لە سالّی ١٩٧٤ کە چاوم بە مستەفا بارزانی کەوت، دوو کەس لەوێ بوون کە ئەمرۆش لێرەن: یەکیان ناوی (پۆل)ە، ئەویتر ناوی (ئێدیت)ە، هەردووکیان بەیەکەوە ناویان "کریس کوچێرا"یە کە زۆرم خۆشدەوێن. ئەوان لەگەلّم هاتن، ئەوەتە لێرەن، نەمدەتوانی لە بیریان بکەم... براڤۆ. )
(چەپلە)

## گفتوگۆ لە بارەی ئەرشیفی نەتەوایەتی
## گفتوگۆ لەگەڵ د.موحسین ئەحمەد عومەر

**پ/ بۆچی تا ئێستا تاکی کورد هەوڵی نەداوە مێژوو و شارستانیەتی خۆی بە ئەرشیف بکا؟**

وەڵام: خۆی بابەتەکە بە پلەیْ یەکەم پەیوەندی بە پێگەیشتنی شارستانی کوردەوە هەیە، لەڕووی سیاسی و فەرهەنگی و ئابووری ...هتد، لەوانەیە بە پلەی یەکەم مەسەلەی جیۆپۆلەتیکی کوردستان رۆلێکی زۆر گرینگی هەبێ لە پاشخستنی کورد لە پرۆسەی سیاسی، کە بە ڕای من ئەوە یەکێك لە خاڵە هەرە گرنگەکانە، جیۆپۆلەتیکی سیاسی واتە شوێن و پێگەی کوردستان لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست وەك پەیوەندی سیاسی و وەك جوگرافیای کوردستان کە هەلکەوتێکی تایبەتی بە کورد و کوردستان دەبەخشێ لە ڕووی سیاسی و بەشداری سیاسی کورد و ڕۆلی لە پەیوەندییەکان لە ناوخۆی و لەگەڵ دەرەوە، هەتا سەبارەت بە رۆژهەلاتناسەکانیش کە دەچینە ناو ئەرشیفیان دەبینین سەرەڕای ئەوەی کە بەرهەمێکی زۆر لەسەر کورد نووسراوە، لەلای ئەڵمانەکان، فەرەنسەکان، ئیتالییەکان لە سەدەکانی ناوەڕاست، لای ئینگلیز لە سەدەی نۆزدەهەم، لای رووسەکان لە سەدەی حەڤدە و هەژدەو نۆزدە، بەلام دەبینین هەردەم بە شێوەیەکی لابەلایی باسی کورد کراوە، ئەمە یەکێك لە کێشەکانی جیۆپۆلۆتیکی کوردستانە، کە ئەو رۆڵەی داوەتە کورد، یانی رۆژئاوا کە هاتووە پەیوەندی بە کورد کردووە، دەبینی بەناو عەرەب یا توورکدا هاتووە، ئیتر بە پێچەوانەشەوە، یانی ئەو مەسەلەیە زۆر گرنگە و کەم بایەخی پێدراوە. مەسەلەی جوگرافیای

سیاسی کوردستان چ رۆڵێکی هەبووە لە مەسەلەی گەشەسەندنی ناسنامەی سیاسی کوردی، ئەوەیان زۆر کەم گرنگی پێدراوە، ئێستاکە ئێمە بەرەو بەجیهانیبوون دەڕۆین، گوایە پەیوەندییەکان لەسەر بنچینەیەکی دیکە دروست دەبن، نەوەك لەسەر بنچینەی جیۆپۆلۆتیکێکی وشك، یاخود بەو شێوەیەی لە سەردەمی رۆژهەلاّتناسەکان هەبووە، یانی پەیوەندییە سیاسییەکان گۆڕاوە و لەسەر ئاستی ولاّت و گروپی فشار و دەزگاکان و کۆمەلانی خەڵکە، ئێستا کوردستانی عێراق بەشێکە لەناو دەوڵەتی عێراق، کوردستانی تورکیا پێگەیەکی هەیە، کوردستانی ئێران پێگەیەکی دیکەی هەیە، بەلاّم ئەوەی کە توانیویەتی تارادەیەك لەو جیۆپۆلۆتیکە سیاسییە دەربچێ کوردستانی عێراقە، ئیتر هەندێك دەرگا بۆ کورد بۆتەوە، یانی تارادەیەك کورد بەرەو ئەوە دەچێ لە پەیوەندییەکی دروستدابێ لەگەڵ جیهان، هێشتا ئەو پەیوەندییە لەسەر ئاستێکی هاوسەنگ نییە، یانی بڵێین دەوڵەت لەگەڵ دەوڵەت، کورد هێشتا نەبۆتە خاوەن دەوڵەتێکی سەربەخۆ، لەبەرئەوە پرۆسە سیاسییەکە لە چوارچێوەی پەیوەندییە سیاسییە جیهانییەکانە کە ئەمڕۆ باسی دەکەین، نەك لە چوارچێوەی جیۆپۆلۆتیکی سیاسی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست، ئەگەرچی هێشتا ئەو بابەتە گرنگی و بایەخی خۆی هەیە، ئینجا دەمێنێتەوە مەسەلەی گەشەسەندنی ناسنامەی سیاسی لەناو کورد خۆی، بێگومان کۆمەڵێك بەربەست هەبووە، بە پلەی یەکەم پێکهاتەی کۆمەڵگای کورد خۆی، ئەو نەکرانەوە سیاسییە کە ماوەیەکی زۆری خایاند کاریگەری هەبووە لەسەر گەشەسەندن و پێشنەخستنی هوشیاری و ناسنامەی شارستانی سیاسی کوردی، ئەوانە هەموویان رۆڵی سەرەکیان هەبووە لە هێشتنەوەی کورد وەکو میللەتێك لە خاڵێکی دیاری کراو کە نەتوانێ گەشە بە ناسنامە و شارستانیەت و مێژوو و ژیانی شارستانی سەرزەوی خۆی بدا، چونکە کە باس لە شارستانیەت دەکرێ مەبەستمان هەموو لایەنێکی ژیانی کوردە، نەك تەنیا زمان و ئەدەبیات و نووسین، لەبەرئەوە دەبینین ئەمڕۆ ئێمە لەناو ئازارێکی زۆر تایبەت دەژین، کە لاوازی کۆمەڵ و تاکی کوردە، بەلاّم لە بارەی دەوڵەمەند کردن و دانانی ئەرشیف، ئەمڕۆ لە کوردستانی عێراق ئەو

دەرفەتە هەیە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی زۆر سیستەماتیك کاربکەین، بێگومان ئەمەش کاری تاکە کەس نییە، فەرەنسیەکان بە درێژایی ٢٠٠-٣٠٠ ساڵ ئینجا توانیا دەزگا دەوڵەتی و رۆشنبیرییەکانی خۆیان دامەزرێنن، یانی لەسەردەمی رۆشنایییەوە بگرە تا دەگاتە دوای جەنگی جیهانی دووەم ئینجا توانیان جێگیرییەك و دەوڵەمەندییەك بدەنە دەزگاکانی خۆیان، ئیتر دەزگای کلتوورییە، رۆشنبیرییە، ئەو دەزگایانەی پەیوەندی بە زمان و ئەرشیف و شارستانی و مێژووی خۆیانەوە هەیە، هەتا بەنسبەت جیهانیش هەمان شتە، یانی بەنسبەت ئەوان ماوەیەکی زۆری خایاند، بەنسبەت ئێمەش ماوەیەکی زۆری دەوێ، بەلاّم تەنیا ئەوە دەڵێم کە بە ئەرشیفکردنی شارستانی کوردی لە هەموو رووێکەوە کاری تاکە کەس نییە، دەبێ کوردەکان بۆ خۆیان زیاتر لێك نزیك ببنەوە، دەبێ تاکە رۆشنبیرەکان زیاتر لێك نزیك ببنەوە و زیاتر بەیەکەوە کاربکەن، چونکە هەموو پرۆژەیەکی مەزن لەمرۆ کاری کۆمەلاّنی خەلّکە بەیەکەوە، نەك کاری تاکە کەسی، یانی ئەوە وەکو رۆماننووسین و شیعر نووسین و کتێب وەرگێرانێك نییە، بەلّکو دەستە جەمعیە، بۆ نموونە دەیان ساڵە داوا دەکەم فەرهەنگێکی ستانداردی کوردی- کوردی هەبێ، دەزگایەکی وەکو کۆڕی زانیاری کوردی کە من حەزدەکەم بڵێم (گۆڕی زانیاری کوردی) دەیان کادیریان هەیە و پارەی باشیشیان لەبەر دەستە، زەوق و چەشەی ئەوەیان نییە پلانێك و پرۆژەیەکی لەو شێوەیە دابنێن، کە ئەوە بە ئاسانی بە کۆمەڵێك خەڵك دەکرێ، بۆ نموونە لە فەرەنسا ساڵانە بەیەکەوە فەرهەنگی گەورە دادەنرێ، چەند مامۆستایەك پیتێك وەردەگرێ، دەبینی لەماوەی مانگێك گەورەترین فەرهەنگ ئامادە دەکرێ و هیچ کێشەیەکیش نییە، با ئێمە لە میللەتانی زیندوو فێری تەکنیکی کار بین، بۆ ئەمرۆ ئەوە پێویستە، ئیتر لە ئەرشیفکردن ئەگەر بەیەکەوە کاربکەین لە کوردستان، ئەو سەلیقەت و روحیەتە هەبێ کە کارێکی رۆشنبیرییە و ئاستێکی رۆشنبیری بەرز نیشان دەدا، دەکرێ هەموو ئەو شتانە کاری لەسەر بکرێ و خەڵك ببینێ و ببێتە واقیع.

پ/ سەرەڕای ئەو خاڵانەی باستکرد، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕۆژهەڵاتناسـەکان شتیان لەسەر کورد نووسیوە و تا ئێستا ئەوانەش کاریان لەسەر نەکراوە، ئەوەیان بۆ؟

وەڵام: مەسەلەی سەرچاوە ڕۆژهەڵاتناسییەکان بێگومان زۆرن، ئـەوە پرۆژەیەکـە کۆمەڵێك کەسی دەوێ کاری لەسەر بکا، من لەلایان خۆمەوە یەکەم کەس بوومە لە کوردستان لەو بیست ساڵەی دوایی کارم لەسەر ئەو پرۆژەیە کردووە، پێـشتر و بەر لە من هیچ کەسێك باسی ڕۆژهەڵاتناسەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوای نـەکردووە، من هاتووم کـارم لەسـەر سەرچـاوە ڕۆژهەڵاتناسـییەکانی لاتینـی و فرەنـسی و ئیتـاڵی و ئیـسپانییەکان کـردووە، سەرچـاوە ڕۆژهەڵاتناسـییە ئینگلیزییـەکان هەموویان بۆ سەدەی نۆزدە دەگەڕێنەوە، هەرچی فرەنس و ئیتـاڵی و ئیـسپانی و ئەوانەی سەردەمی لاتینن دەگەڕێنەوە بۆ سـەدەی دەیـەمی زایینییـەوە، لـەوێوە دەست پێدەکەن تاکو ساڵانی بیستەمی سەدەی بیستەم، بەدرێژایی ئەو ماوە زۆرە شت لەسەر کورد نووسراوە، ئیتر من کـارم لەسـەر ئەوانـە کـردووە، پـێش مـن کەسێکی تر کاری لەسەر ئەوانە نەکردووە.

پ/ پێتوایە هەوڵێکی تاکە کەسی بەس بێ بۆ ئەو جۆرە پرۆژانە؟

وەڵام: نەخێر، بەهیچ شێوەیەك هەوڵی تاکە کەسی بەس نییە، ئەوە هێشتا دەبێ کاری لەسەر بکرێ، ئەگەر بمانەوێ وێنەیەکی پوخت لەسەر کوردستان لەو هـەزار ساڵەی دوایی بزانین دەبێ هەموو ئـەو سەرچـاوانە وەربگێڕدرێنـە سـەر کـوردی، لەیەکـەم گەڕیـدەی ئیتاڵییـەوە "مـارکۆ پۆلـۆ" کـە بـەر لـەویش هەیـە، لـە "پتۆلیمی"یەوە دەسـت پێبکـەین، یـانی دەتـوانین هێـشتا ئـاڵۆزتری بکـەین و کەمێك بچینەوە ناو مێژوو، بەڕاستی دەبێ لە "کسێنۆفۆن" کـە لـە نـاو کـورد هەندێ جار بە (زەینەفۆن) ناوی دێ، دەست پێبکـەین کـە کتێبی "ئاناباز"ی نووسیوە، باس لـە گێڕانـەوەی شـەڕ و شـۆڕەکانی خـۆی دەکـا لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست، کە هێرشی کردۆتە سەر کوردستان و ئێران و ئەفغانستان و ناوەڕاستی ئاسیا و پاشان دیـسان بـە کوردسـتاندا گەڕاوەتـەوە یۆنـان، دەبـێ لـە سـەدەی

پێنجەمی زاینییەوە دەست پێ بکەین، بەرگ بەرگ ئەو مێژووەی کورد بنووسرێتەوە و نیشان بدرێ، یانی سەرچاوەکان وەربگێڕدرێن، بەڵام کورد بۆ خۆی و لە ڕوانگەی خۆی دەبێ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو سەردەمانە بکا تا دەگاتە ئەمڕۆ، بەر لەهەموو شتێك دەبێ سەرچاوەکان وەکو خۆی وەربگێڕدرێن و چاپ و بلاّوبکرێنەوە بەناو خەڵك، پاشان دەکرێ پرۆژەیەکی مێژوویی شارستانی لەسەر ئەوانە بنیاد بنرێ، ئەویش خوێندنەوەی ژیان و مێژوو و شارستانیەتی کوردە، کە کورد خۆی ئامادەی بکا، لەڕوانگەیەکی کوردانەی مۆدێرنەوە بنووسرێ، نەك لە ڕوانگەیەکی ڕۆژهەڵاتناسانە وەکو ئۆروپییەك، یاخود وەکو بێگانەیەك کە بیەوێ ئەو شتە بۆ کورد بکا، ئەخێر دەبێ کورد خۆی ئەو شتە بکا، یانی سەرەتا سەرچاوەکان بکرێنە کوردی و دوایی بە دیراسە هەموو ئەو ماوە دوور و درێژە بەرگ بەرگ بنووسرێتەوە، ئیتر سەدان گەریدە هەیە، لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدە و کۆنتریش، بە کوردستاندا تێپەڕیون و لە کوردستان ژیاون و لەسەر زمان و عادات و تەقالیدی کوردیان نووسیوە، لەسەر مێژوویان نووسیوە، لەسەر زۆر شتیان نووسیوە کە تایبەتە بە مێژوو و شارستانی و کولتووری کورد،

**پ/ گومانی تێدانییە ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە کە ئەو شتانەیان نووسیوە بەشێك لە یادەوەری ژیانیان بووە لە کوردستان، بەڵام بۆچی تاکی کورد لەوەشدا نەیتوانیوە وەکو پێویست یادەوەرییەکانی ژیانی خۆی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست بنووسێتەوە؟**

وەڵام: دەتوانم بڵێم ئێمە هەموومان تاکی کورد بەگشتی و ڕۆشنبیری کورد بە تایبەتی و نوخبەی سیاسیمان تاڕادەیەك لەناو بازنەیەکی داخراو دەخولێینەوە، بەبێ ئەوەی دەسەڵاتی دەرچوونمان هەبێ بەو شێوەیەی کە کورد خۆی دەیەوێ، یانی کە دەڵێین جیۆپۆلۆتیکی کوردستان کاریگەری لەسەر پێشنەخستنی شارستانی و ناسنامەی سیاسی کوردی هەیە، ئەوە مەسەلەیەکی ڕاست و دروستە، سەرەنجام لەناو جۆرێك لە ناتەواوی دەژین، من دەپرسم ئایا تاکی کورد خۆی دەسەڵاتی چییە بۆ ئەوەی لەناو ئەو ناتەواوییە دەربێ، ئێمە خۆمان دەبێ

دەریچین، بە چ دەردەچین؟ بێگومان بە کارکردن و خەباتکردن و بەرهەمهێنانی دروست و کارکردنی ئۆرگانیزەکراو دەردەچین، بەکارکردنی تاکە کەسیش دەردەچین، بێگومان بە کارکردنی کۆمەڵیش دەردەچین، لەبەرئەوە لەم روانگەوە کە باسی دەکەین، مەسەلەی ئەرشیفە، مەسەلەی نووسینەوەی مێژووی کوردە، مەسەلەی سەرخستنی کێشەی کوردە وەکو کێشەیەکی سیاسی رەوای میللەتێك، هەموو ئەوانە کاری دەستەجەمعیە و دەبێ لەم روانگە کورد بەیەکەوە ئیش بکا، سەرەرای ئەمەش من لە کاری رۆشنبیری تارادەیەك باوەرم بە کاری تاکە کەسی هەیە، بەلام هەندێك شت هەیە لەناو کولتوور و رۆشنبیری کوردی کە نیشکردنە لە بواری زمان و دانانی دەزگاکانی زمان وەکو دەزگاکانی لێکۆڵینەوەی زمان و شارستانی و ئەرشیف و مۆزەخانە، ئەوانە کاری تاکەکەس نییە، کاری کۆمەلانی خەلکە، خۆی دەبێ حکومەتی هەرێم پرۆژەی ستراتیژی هەبێ لەرووی دانانی ئەرشیف و دەزگای رۆشنبیری کوردی، کە بەداخەوە لەم رووەوە زۆر کارنەکراوە.

**پ/ بەلام بۆ ئەمەش حکومەت دەلێ کۆری زانیاری هەیەو بودجەو شوێنیشیان هەیە؟**

**وەلام:** بێگومان وایە و مەسەلەکە پەیوەندی بە حکومەتی هەرێمەوە نییە، راستە ئەوان دریغی لەوە ناکەن، بەلام مەسەلەکە لە شوێنێکی ترە، ئەویش پەیوەندی بە هوشیاری سیاسی تاکی کوردەوە هەیە، پەیوەندی بە ئامادەیی تاکی کوردەوە هەیە وەکو میللەتێك کە چەند ئاور لە دواوە دەداتەوە و چەندیش دەیەوێ بەرەو پێشەوە بچێ، بەراستی ئەمە پەیوەندی بەم لایەنەوە هەیە.

**پ/ لە پاڵ هەموو ئەوانەدا پێتوانییە دەبێ تاکی کورد رابردوو بخوێنێتەوە بۆ ئەوەی لە ئێستادا سوودی لێ وەربگرێ، بۆ نموونە لەو ماوەیەدا دەزگای بەدرخان کتێبێکی ئەوزاد عەلی ئەحمەدی چاپکرد "پارتی دیموکراتی کوردستان لەنێوان کوتەك و تەسلیم بووندا"، کە باس لە سالی ۱۹٦۱- ۱۹٦۲ دەکا، رووداوەکانی ئەوکات هەمان رووداوی ئێستان؟**

وەلأم: لە راستیدا ئەو کتێبەی کاك ئەوزادم نەبینوە، بۆیە ناتوانم قسەی لەسەر بکەم و ئەشمخوێندۆتەوە، بەلأم دەزانم ئێمە لەناو کێشەیەکی ئالۆزی شارستانی سیاسی، فەرهەنگی، هەتا وجودییش دەژین، ئیمرۆ کە کوردستانی عێراق لەناو جۆرێك لە ئازادی و جێگیری سیاسی و فەرهەنگی و هەتا کۆمەلأیەتیش تا رادەیەك دەژین، ئەگەر کار نەکەین لەوانەیە ئەو تەجرەبەیەمان لەدەست بچێ، لەبەرئەوە کارکردنی پلان بۆ دانراو لەسەر ئاستی تاکە کەس و کۆمەلأنی خەلك و دەزگا سیاسی و حکومییەکان، لەسەر ئاستی حکومەت و نوخبەی سیاسی، دەبێ بنچینەی دەزگای کولتووری بەهێز لەناو کورد دابمەزرێ، ئەوەش دەکرێ بە شێوەیەکی زۆر سادەو ساکار و بەبێ هیچ تێچوونێکی زۆری ماددی ئەو کارە جێبەجێ بکرێ، چونکە ئەگەر ئەو پرۆژانە جێبەجێ بکرێن، لە ئایندەدا باشتر و خۆشتر و ئاسانتر ئەوەکان دەتوانن کاربکەن لەسەر هەمان پرۆژە.

**پ/ سەرەڕای هەمور ئەو خالە نێگەتیڤانە، خالێکی دیکە کە جێی پرسیارە ئەویش نەبوونی تاکی مێژوونووسە، ئەوەیان چەندە کاری کردۆتە سەر ئەرشیف و مێژووی کورد؟**

وەلأم: لە سەرەتادا باسمانکرد، لە مەسەلەی نووسینەوەی مێژووی کورد، ئەگەرچی وەکو نووسینەوە، وەکو فکرە من لەگەلَ ئەو پرۆژەیەدا نیم، چونکە ئەمە پرۆژەی ولأتانی ستالینیزمیە، لەسەردەمی ستالینیزم ئەو پرۆژانە زۆر بوو، لەسەردەمی بەعس بۆ نموونە، دەیانویست جارێکی دیکە مێژوو بنووسنەوە لەروانگەی بەعس، مێژووی میللەتانی موسلمان و رۆژهەلأتی ناوەڕاست، دەیانویست بە ئارەزووی خۆیان مێژووی کورد، مێژووی ئێران، مێژووی سەردەمی عوسمانی، مێژووی ولأتانی عەرەبی بنووسنەوە بەپێی روانینی ئیدۆلۆژی تایبەتی خۆیان، من دژی ئەوەم، نابێ مێژوو لە روانگەیەکی ئیدۆلۆژی تایبەتەوە بنووسرێ، بە پێچەوانەوە مێژوو هەموو رۆژ دەنووسرێتەوە، مرۆڤ ئەگەر کاریکاو بەرهەمی هەبێ، بەرهەمی کۆمەلَ، تاکە کەس، حکومەت، دەزگاکان، میللەتی

زیندوو رۆژانە مێژووی خۆی دەنووسێتەوە، ئەو شتانەی بەرهەمی دێنێ ئەوە بەشێکە لە مێژووی ئەوان، ئیتر لە باڵەخانەیەکەوە بگرە تا دەگاتە دیوانێکی شیعری و هەڵوێستێکی سیاسی، تا دەگاتە دروستکردنی دەزگایەك و پاراستنی ناوچەیەکی دیاریکراو و دروستکردنی هەرێم یا دەوڵەتێك، یانی ئەوانە هەمووی بابەتی ئەوەن کاریان لەسەر بکرێ، ئیتر میللەتێك کە لەم رووەوە کاریکاو زیندوو بێ، رۆژانە مێژووی خۆی دەنووسێتەوە، بەڵام ئەو شتانە لەناو کورد نەکراوە و بە دەزگایی نەکراوە. یانی ئێمە دەزگامان نییە کار لەسەر ئەو شتانە بکا، بۆ نموونە دەزگایەکمان نییە کار لەسەر مێژووی کورد بکا بە شێوەیەکی بەردەوام و درێژ خایەن، راستە ئێمە زانکۆمان هەیەو لە زانکۆ کار دەکرێ و شتی زۆر نایاب کراوە لە بواری مێژوو، ئەگەر تەنیا مەبەستت مێژوویێ، لێکۆڵینەوەی باش کراوە، بەڵام مەسەلەکە جوولاندنی کۆمەڵانی خەڵك و تاکی کوردە، کە بە ئاراستەی کورد و شارستانی کورد و مرۆڤی کورد کاریکا، لە هەمان کات بەرەو ئاراستەی ئاینده کاریکا، یانی ئێمە ئەو کێشەیەمان هەیە، سەرەنجام هەستدەکەین جۆرێك لە ئاوارەیی هەیە لای مرۆڤی کورد، کە لەبەرئەوەی زۆر چەوساندنەوەی بینیوەو زۆر ئاوارەیی بینیوە و زۆر لەناو جێگیری سیاسی پوخت کە لەگەڵ روح و گیانی ئەو بگونجێ نەژیاوە، دەبینین هەر شتێك کە لە دەرەوە بێ ئەو پێی شاگەشکە دەبێ، سەرەنجام خۆی لەبیر دەکا، ئێمە دەمانەوێ جارێکی تر خۆمان بدۆزینەوە و ببوژێینەوە و سەر لەنوێ زیندوو ببینەوە، باس لە رێکخستن و دروستکردنی پرۆسەی سیاسی دەکرێ، دەبێ پرۆسەی سیاسی بە ئاراستەیەکی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و عەدالەتی کۆمەڵایەتی بڕوا لەسەر ئاستی تەواوی گەلی کورد، ئەوە خزمەتی مرۆڤی کورد دەکا لە ئێستا و ئاییندە، چونکە هەر میللەتێك لە ناوەوە بەهێزبێ لە رووی سیاسی و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ماددی هێزێکی مەزن و وێنەیەکی جوان دەنێرێتە دەرەوە، سەرەنجام هیچ دوژمنێك، نەیارەکانی ناتوانن زەفەری پێ ببەن، دەبێ بەو ئاراستەیە کاریکەین، ئەگەر ئێمە بتوانین دەزگای زانستی و رۆشنبیری و مێژوویی خۆمان دابنێین لە کوردستان بەردی بناغەی شارستانیەکی مەزن دادەنێین، ئەمڕۆ ئێمە پێویستمان بەوەیە بە

زووترین کات لەسەر زمان کاربکرێ، کە بەڕای من بەپەلەترین شتە، بەشێوەیەکی زۆر عەقلانی و زۆر مۆدێرن و زۆر دیموکراسیانە لەسەر ئەو پرۆژەیە کاربکرێ، بێگومان کێشەی زمانمان زۆرە، بەلاّم هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە دیالێکتێکی دیاری کراو بەسەر کورد بسەپێنێ، چونکە دواتر ئەوە کوردە بۆ خۆی بڕیاری لێ دەدا، هەتا سیاسییەکیش ناتوانێ بڵێ نابێ ئەو دیالێکتە ببێتە ستاندارد و دەبێ ئەوە ببێتە ستاندارد، ئەوە ئیشی سیاسییەك نییە، ئەوە ئیشی ژیانی رۆشنبیری و ماددی کوردە کە دەیچەسپێنێ و دەیسەپێنێ، ئەمرۆ زمانێکی ستانداردی کوردی هەیە، ئەو زمانەی من و تۆ قسەی پێ دەکەین ئەوە زمانێکی ستانداردە، بەلاّم ئێمە پێویستمان بە فەرهەنگە، فەرهەنگێکی ستانداردی کوردی- کوردی، کە وەکو پرۆژەیەکی شارستانی دەتوانی کۆمەلاّنی خەلّکی کورد لێك نزیك بکاتەوە، لە هەمان کات بە کۆمەلّێ خەلّك زۆر بە ئاسانی دەشێ ئەم کارە بکرێ، با دەزگایەکی تایبەتی بۆ دروست بکەن، تەنیا بۆ دروستکردنی فەرهەنگ لە فرەنسا "ئەنستیتوی زمانی فرەنسی" هەیە کاری تەنها کارکردنە لەسەر زمانی فرەنسی، سالاّنە فەرهەنگی ستانداردی زمانی فرەنسی نوێ دەکرێتەوە. ئەم دەزگایە پەنجا پسپۆری زمانەوانی هەیە بەردەوام کار لەسەر زمانی فەڕەنسی دەکەن، سالاّنە چاپی نوێی ئەو فەرهەنگە بلاّودەکەنەوەو دەچێتە ناو خەلّك، هیچ دەزگایەك مافی ئەوەی نییە هیچ فەرهەنگێکی دیکە بەکاربێنێ جگە لەو فەرهەنگەی حکومەتی فەڕەنسی بڕیاری لەسەر داوە، کە فەرهەنگێکی تەواوی زمانی فرەنسییە، با ئێمەش ئەو پرۆژانەمان هەبێ، ئێمە باس لە نەبوونی ئەرشیفی خۆمان دەکەین، بەلاّم کوا ئێمە چ کارمان کردووە لەسەر ئەو مەسەلانە، کەی دەزگامان هەیە، فەرموو کۆڕی زانیاری کوردی هەیە، من هیچ دژایەتیەکم بەرامبەر کۆڕی زانیاری کورد نییە، بەلاّم ئەوان ماددەیان لەبەر دەستە، کاتیان لەبەر دەستە، شوێنی باشیان هەیە، دەتوانن داوا لە خەلّك بکەن بێن کاریان لەگەلّ بکەن، کارە سەرەکییەکە لەوانەیە چەند پسپۆڕێکی زمانەوانی کاری لەسەر بکەن، بەلاّم خۆ کاری دیکە هەیە بە کۆمەلاّنی خەلکی ئاسایی دەکرێ، وەکو هاوکارێك. بۆ ئەوەی بتوانین

لەم کێشە ئاڵۆزە دەرچین دەبێ هەموو لایەنێکی ژیانی کوردی بە نەخشەو پلان دانان بڕوا، ئەوە لە زۆر کێشە دوورمان دەخاتەوە.

**پ/ لەو بۆشایی و بایەخنەدانی کورد بە مێژوو و شارستانیەتی خۆی، ئەو بۆشاییە چەندە کاری کردۆتەوە سەر مێژوو و شارستانیەتی کوردی و ئەو شتانەی چەواشە کراوە و دژایەتی کراوە؟**

وەلام: زۆر زۆر کاری کردووە، بە درێژایی ٦٠٠ ساڵی رابردوو، لەو سەردەمەیەوە کە ناکۆکی ئایینی دروست دەبێ لەنێوان سوننە و شیعە لەنێوان سەفەوییەکان کە نوێنەرایەتی ئایینزای شیعی دەکەن لە ئێران کە دژایەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیان دەکرد، ئەو سەردەمە بەشی زۆری کوردستان لەناو ئیمپراتۆری عوسمانی بوو، بەشێکیش لەناو ئیمپراتۆری فارس بوو، لەو کاتەوە دژایەتی کورد دەکرێ، یانی پێشتریش دژایەتی کورد دەکرا، یانی هێشتاش دەتوانین لەمێژوو بچینە خوارەوە، دەمێکی زۆرە دژایەتی کورد دەکرێ، ئێمە کێشەیەکمان نییە، بۆ ئەو ماوەیەی کە سەردەمی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، واتە پێش هاتنی سەفەوییەکان و عوسمانیەکان، پێش دامەزراندنی دەوڵەتی ئێران و ئیمپراتۆری عوسمانی تەواوی میللەتانی رۆژهەلات بە کورد و عەرەب و فارس و تورک و .....هتد" هەموو بەناوی میللەتی موسڵمان کاریان دەکرد، یانی مەبەستم لەماوەی سەلاحەدینی ئەیوبی و پێش و دوای ئەوە، ئەو مێژووە بەشێکە لە مێژووی ئێمە، ئەوە مێژووی ئێمەیە و ناتوانین ئەو مێژووە لەخۆمان جیابکەینەوە، ئەوە مێژوو و ژیانی ئێمەیە، ناتوانین لەخۆمانی جیابکەینەوە، ئیسلام لەو سەردەمدا ناسنامەی سیاسی هەموو میللەتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بووە، ئەسلەن لە سەردەمی سەلاحەدین ئەیوبی کورد لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست حوکمی کردووە و فەرمانڕەوایی هەموو جیهانی ئیسلامی کردووە، بەلام دواتر کە ناکۆکی ئایینی دەست پێدەکا دەبێتە هۆی دروست بوونی بزووتنەوەی سیاسی ئیتنیکی، نەتەوایەتی،پەیوەندییەکان و شتەکان هەموویان دەگۆڕێن، لەو سەردەمە کورد مەوقیعێکی تایبەتی هەبوو لەناو ئەو ناکۆکییە ئایینییە،

سەرەڕای ئەوەی کە زۆر زیرەکانە و ئازایانە خۆی پاراست، بەلاّم بەدرێژایی ٦٠٠ ساڵ دژایەتی کورد کراوە بەناوی مەزهەب، قەلاّی دمدم ئەنجامی شەڕی مەزهەبی سەفەوییەکانە دژی کورد، پێویستە ئەو شتە باس بکرێ، مێژوونووسەکان بۆ باسی ناکەن، خۆ لە ئەدەبدا ئەوە بە درێژی لەسەری نووسراوە، بەلاّم لە گەنجێکی کورد بپرسەو بلێ داستانی قەلاّی دمدم چییە، دەڵێ داستانێکی فۆلکلۆری کوردییە، بەلاّم زەمینەی مێژوویی ئەو داستانە نازانێ، نازانێ ئەمە داستان و شەڕێکی گەورە بووە کە سەفەوییەکان دژی کورد کردوویانە، هێرش کراوەتە سەر کوردستان بۆ ئەوەی کورد مەزهەبی خۆی بگۆڕێ، لەسەر مەزهەب گۆڕین کە ئەوانیش موسڵمان بوونە و کوردیش موسڵمانە، بەلاّم ئەوان دەیانویست کورد بخەنە سەر مۆدێلی خۆیان، کە ئەمە بۆ کورد شتێك بوو قووت نەدەدرا، سەرەنجام دژی کورد کوشتار دەکەن، ئیتر ئەو داستانە لە هوشیاری و روانینی تاکی کورد بۆتە داستان، بەڕاستیش داستانە، داستانێکی سەربەخۆیی مرۆڤی کوردە، مەزنترین داستانی کوردە، عوسمانییەکان بەهەمان شێوە، ئەوانیش دژایەتی کوردیان کردووە، بەلاّم لەوێ تا رادەیەك دژایەتییەکە بەو شێوەیە نەبووە کە سەفەوییەکان کردوویانە، ئەمڕۆش رژێمی ئێران هەمان بەزم دەکا دژی کورد، هەمان سیاسەتی سەفەوی درێژە پێدەدا، فەرموو ئێستا لەم رۆژانە گوندەکانی سەر سنوور بۆردومان دەکرێ، هەمان رووداوە، هیچ شتێك نەگۆڕاوە، کەواتە تاکی کورد دەبێ هەموو ئەو شتانە ئەرشیف بکا و خوێندنەوە و روانینی بۆی هەبێ.

**پ/ یانی مەبەستت ئەوەیە ئیسلام و بەکارهێنانی لە دژی کورد زیانی بە کورد گەیاندووە؟**

وەلاّم: ئەی چۆن، لەسەردەمێکدا ئیسلام هێزێکی پاراستنی کورد بووە، بەلاّم دواتر ئیسلام وەکو چەکێك بەکارهێنراوە دژی کورد، رەنگە ئەمە پەیوەندی بە ئیسلامەوە نەبێ وەکو ئایین، چونکە ئیسلام لەناو کورد زیاتر وەکو داب و نەریت دێتە بەرچاو، وەکو مەسەلەی ژن و ژنخوازی و ئەم جۆرە شتانە، کورد روانینی

تایبەتی خۆی هەیە لەم ڕووەوە، یانی لەلای فارسەکان ئیسلام بۆتە ناسنامەی سیاسی، شیعیزم بۆتە ناسنامەی سیاسی، ئیدیۆلۆژی دەوڵەتی سەفەوی کە لەگەڵ رووخانی شا جارێکی تر هاتنەوە، لە لای کورد هەڵکەوتەکە بەم چەشنە نەبووە، ئیسلام هیچ کاتێك لە لای کورد وەك ناسنامەی سیاسی سوودی لێ وەرنەگیراوە، بێگومان ئەمەش هۆکاری خۆی هەبووە، ڕاستە لە سەردەمی نوێ تەریقەتە ئایینییەکان دەرکەوتوون وەك قادری و نەقشبەندی، بزوتنەوەی سیاسیشیان بەرپاکردووە، بەڵام ئەم بزووتنەوەیە بە پلەی یەکەم بۆ خۆ پاراستن بووە وەك لەوەی بووبێتە ماتۆرێکی ئیدیۆلۆژی بە ئاراستەی ناسنامەی سیاسی، پاشان لە کوردستان هەردەم کۆمەڵێك ئایینزا هەبوونە، هەردەم جۆرێك لە بەیەکەوەژیانی ئەم ئایینزایانە هەبووە، هەرچی پەیوەندی کورد و عوسمانییەکانە، ئەمەیان جۆرێکی تربووە، جیاوازی ئایینی و ناکۆکی ئایینی لە نێوان ئەم دووانە ئالۆز نەبووە بووبێتە هۆی لێکدان و دووبەرەکی لەسەر ئاین. کورد هەمان پەیوەندیشی لەگەڵ عەرەب هەبووە. ئەسلەن پەیوەندی کورد و عەرەب زۆر تازەیە، تا ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردووش کورد و عەرەب زۆر لێك دوور بوون، زۆریش جیاوازی کولتووری و شارستانی لە نێوانیان هەیە، پەیوەندی خراپ لە نێوان کورد و عەرەب لەگەڵ هاتنی ئیدیۆلۆی ناسیۆنالیزمی پان عەرەبیزم دەست پێ دەکا، ئەمەش بە پلەی یەکەم لەگەڵ هاتنی ناسیۆنالیستەکان سەرهەڵدەدا، ووردتر لەگەڵ حوکمی سەردەمی سەدام لێك نزیکبوونەوەی خراپ و پەیوەندی خراپ دەست پێ دەکەن، ئەم پەیوەندییەش هێشتا زیندووە و لەبەرچاوە چیان لە کورد کرد لە ئەنفال و کیمیایی، ئەنفال ئێستاش بەردەوامە، فەرموو هەر ئەمڕۆ لە کەرکوك خێزانێکی بێ وەی کوردیان قەتل و عام کرد. بەڵام هەرچی لە بارەی مانەوەی کورد بووە لە سەردەمە کۆنەکان لە نێو ناکۆکی ئایینی و پەیوەندییەکان لە نێوان زلهێزەکانی سەفەوی و عوسمانی، کورد زۆر سەرکەوتوو بووە لە خۆپاراستنی خۆی و خاکەکەی، بەدرێژایی مێژوو سەرەڕای ناتەواوی و نالەباری جیۆپۆلۆتیکی کوردستان بەڵام لەگەڵ ئەوەش کورد لەم ناکۆکییە ئایینییە، سیاسییە، فەرهەنگییە، تاڕادەیەك توانیویەتی سەرکەوتوو بێ، یانی هەر هیچ

نەبێ خۆ پاراستن و مانەوەکەی بەو شێوەیەی کە هەبووە و خاکی کوردستانیشی وەکو خۆی پاراستووە، بەڕاستی سەرکەوتوو بووە و باش لێی دەرچووە، ئەمڕۆ بە شێوازێکی دیکە دژایەتی کورد دەکرێ، ئەمڕۆ بەناوی کەمالیزم دژایەتی کورد دەکرێ، کەمالیزم لە شێوە ئیسلامییە نوێخوازەکەی کە حزبی ئەکەپە لە تورکیا بە پشت ئەستووری سوپای کەمالیزم فەرمانڕەوایی دەکا، لە لایەکی دیکە، بەناوی ئیدیۆلۆژی ئیسلامی عەرەبی قەومی کە من ناوی دەنێم "پان ئیسلامیزمی عەرەبی" یان "پان ئیسلامیزمی عەرەبی سیاسی و وەهابی" ئەمڕۆ دژایەتی کورد دەکرێ، لە کورد دەدرێ، ئەو هەموو تەقینەوانە چین ئەگەر دژایەتی کورد نەبن، ئەو هەموو کارە تیرۆریستییەی لە کوردستان دەکرێ هەمووی دژایەتیکردن و لەناوبردنی کوردە، چونکە ئەوان نایانەوێ کورد بەو شێوە بژیێ کە خۆی دەیەوێ، بۆ لەناوبردنی ئەم تەجرەبەیە کە کورد خۆی دەستی هەیە لە دروستکردنی، ئەوان دەیانەوێ کورد روانینی بۆ خۆی نەبێ، بەڵکو لە روانگەی روانینی ئەوانەوە کورد بژی، ئەوەش ئەستەمە، لەبەرئەمە، ئەم تەجرەبەیەی ئەمڕۆ هەمانە مەزنترین تەجرەبەیە لە مێژووی کورد، ئەمڕۆ پرۆسە سیاسییەکە شکلێکی دیکەی هاوچەرخی وەرگرتووە، دەبێ بە ئاراستەی ئاینده کاربکەین لەسەر ئەم پرۆژانە.

دیانە : مەسعودی مەلا هەمزە

## دەربارەی زمانی ستاندارد
## گفتوگۆ لەگەڵ د. موحسین ئەحمەد عومەر

**پ/ بۆچی زمانی یەکگرتووی کوردی تا ئێستا لە ناو کورددا کێشەی ساغ نەبۆتەوە؟ ئایا ئەمە پێویستی بە بڕیارێکی سیاسی هەیە یان ئەوەتا ڕۆشنبیران خۆیان کەمتەرخەمن؟**

وەڵام / دروست نەبوونی زمانی ستاندارد لە ناو کورد لە بنچینەدا بۆ کێشەی سیاسی مێژوویی کورد دەگەڕێتەوە. خۆتان دەزانن لەم سەد ساڵەی دوایی چەندان گۆڕان و کارەساتی سیاسی بەسەر کورددا هاتووە، هیچ کاتێك ئەو مەرکەزییەتە سیاسییەی بۆ عەرەب و تورك و فارس هەڵکەوتووە، بۆ کورد هەڵنەکەوتووە. مەسەلەکە پەیوەندی بە ڕۆشنبیرانەوە نیە، پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە هەیە، ئەمەش لە ناو کورد وەك دەسەڵاتێکی کوردی و لە خزمەتی کورد بوونی نەبووە، ئەو ئاستەی ئەمڕۆش زمانی کوردی پێی گەیشتووە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتێکی لابەلا و خەباتی کورد خۆی.

**پ؟ ئێستا کاتی ئەوە نەهاتووە بڕیار لەسەر زمانێك بدرێت لە ناو هەموو کورددا کاری پێ بکرێت؟ واتا هەم بۆ نووسین و هەم بۆ خوێندنەوە و تەنانەت بۆ وتارەکانیش؟**

وەڵام: خۆی دەسەڵاتی کوردی دەتوانێ زارێك هەڵبژێرێ و بیکاتە بنچینە بۆ زمانی ستاندارد. دەشێ سۆرانی بۆ ئەم کارە زۆرتر لە بار بێ، چونکە زۆر کاری تێدا کراوە. دوایش لە ڕووی تەکنیکییەوە سۆرانی ڕێك و پێکتر و ڕەوانتر بووە. پاشان کە دەسەڵات زارێك هەڵدەبژێرێ مانای ئەوە نادا زارەکانی تر دەبێ لە ناو

ببڕێن، نەخێر، زارەکانی تریش دەشێ کاری بۆ بکرێ و گرینگیان پێ بدرێ، چونکە ئەمانە هەموویان بە کەلەپوور و سامانی کوردی لە قەڵەم دەدرێن. بەلام دەستەلات ئەم زارە چۆن هەڵدەبژێرێ ؟ ئەمە پرسیارە سەرەکییەکەیە. ئایا ئەمە مەسەلەیەکی ئاڵۆز نیە؟ هەڵبەت.

**پ/ ئەگەر سەیر بکەین تا ئێستا زاری بالادەست لە نووسین و خوێندنەوە و پێشکەوتن و گۆڕان شێوە زاری سۆرانی بووە، بۆچی دەبێ دوای چەندان ساڵ خزمەتکردن بەو شێوە زارە بۆ زمانی یەکگرتووی کوردی ئێستا بڕیار لەسەر زارێکی دیکە بدرێت کە خزمەتێکی بەرچاوی نەبووە؟ ئایا ئەمە دەستێکی سیاسی لە پشتەوە نییە؟**

وەلام: ئەمە پەیوەندی بە گەشەسەندنی پڕۆسەی سیاسییەوە هەیە لە ناو کورد، پێم سەختە بتوانرێ شوێنی سۆرانی بە زارێکی دیکە پڕبکرێتەوە.

**پ/ دەوری کۆڕی زانیاری کوردستان بۆ دروست کردنی زمانی یەکگرتووی کوردی چییە ئایا ئەوان توانیویانە شتێ بەشتێ بکەن بۆ زمانی کوردی؟**

وەلام/ کۆڕی زانیاری زۆر کاری زمانەوانی و مێژوویی و ڕۆشنبیری کردووە، بەلام تا ئێستا بۆ ئەم کارە بە پلان دانان کاریان نەکردووە. کۆڕی زانیاری لە حەفتاکان سەردەمی زێڕینی بوو، ئێستا بۆتە (گۆڕی زانیاری) لە کاتێکدا دەبوایە زیاتر کار بکرایە، چونکە ئەوان ئازادی و پارەیان لەبەر دەستە.

**پ/ زۆرجار پرسیاری ئەوە دەکرێت بۆچی تا ئێستا کورد نەبۆتە خاوەنی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتوو (ستاندارد)؟ ئایا لەبەر ئەوەیە کە کورد تا ئێستا خاوەنی کیانێکی سەربەخۆ نییە، یان کۆمەڵێك هۆکاری ناوەکی هەن پاڵپشت نین لە دروست بوونی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتوو؟**

وەلام/ هۆکارەکە نەبوونی کیانێکی سەربەخۆیە.

**پ/ ڕۆلی دەسەلات چۆن دەنرخێنرێ لە دروست بوونی زمانی یەکگرتوو؟ پێتان وایە دەسەلات بەو هەموو سەلاحیاتەی هەیەتی دەتوانێ بڕیار لەسەر بە ستانداردکردنی زمانی کوردی بدات؟**

**وەلام / دەستەلات ماتۆڕی ئەم کارەیە.**

**پ/ زاری سۆرانی تا چەند بارو دۆخی بۆ رەخساوە ببێ بە زمـانی یـەکگرتووی کوردی، لە کاتێکدا دەزانین ئـەو زارە تایبەتمەندیـەکی زۆرتـری هەیـە و هـەر لەسەردەمی بابانەکانەوە لە نووسن و خوێندنەوە و چاپکردنی کتێب و رۆژنامە بەردەوامە تا ئێستا و کەلەپورو کتێبخانەیەکی مەزنی کوردی بەم زارە لەبـەر دەستدایە؟**

وەلام/ زاری سۆرانی ئێستا زاری ستانداردە، ئەمـەش کـەس نەیـسەپاندووە. کورد دەتوانێ سوود لەم بنچینەیە وەرگرێ بۆ دەوڵەمەنـدکردنی. کرمـانجی ئـەو پانتاییەی نیە، بەلام دەشێ سۆرانی بە کرمانجی دەوڵەمەند بکرێ.

**پ/ بۆچی تا ئێستا حکومەتی هەرێمی کوردسـتان بڕیـاری نـەداوە ئـەم زاری سۆرانیە ببێ بە زمانی یەکگرتووی کوردی لە کاتێکـدا خۆیـان وەك سـەرۆکی حکومەت و سەرۆکی هەرێم و هەموو دام و دەزگاکان ئەم زارە بەکاردەهێنن و نوخبەی کوردیش لەگەڵ ئەوەدان ئەو زارە زمانی ستانداردە؟**

وەلام: بڕیاردان لەم بارەیەوە کێشە دروسـت دەکـا. ڕەنگـە ئەنجامەکـەی بـە پێچەوانەوە بکەوێتەوە. بەلام من قەناعەتی تەواوم هەیە، سۆرانی ئێستا زمـانی ستانداردە و دوو سەد سالی نووسین و پراتیکی لە پشتە، ئـەم مێـژووە مەحاڵـە بشێوینرێ. بەلام ئێمە دەبێ لەوە زیرەکترین ببینە هۆی کێشە لە ناوەوەی کورد، ئێمە دەتوانین سوود لە هەموو زانی کوردی وەربگرین.

**پ/ لە هەنگاوەکانی دەسەلاتدارانی کوردی ئەوە تێبـینی دەکرێـت کـە پێیـان زوویێت هێشتا بیر لە مەسەلەیەکی وەك زمانی کوردی بکرێتەوە، ئایا پێتان وایە بیرکردنەوەی دەسەلاتی کوردی هێشتا پێنەگەیشتووە بۆ مەسـەلەیەکی وا، یـان ئەمە لە توانایاندا نییە؟**

وەڵام/ لەو باوەڕەم مەسەلەکە چونکە هەستیارە دەستەڵاتدارەکان ناتوانن راستەوخۆ بێ ئاووهەوای لەبار دەست لە شتێك وەردەن کە پەیوەندی بە چارەنووس و فەرهەنگی میللەتێکەوە هەیە. بەڵام من لەو باوەڕەم کە زمانی کوردی زۆر لە ستاندارد بوون نزیك بووەتەوە، ئەمەش مەسەلەیەکە کار و پلانی دەوێ.

**پ/ رای ئێوە سەبارەت بە خوێندنی زمانی کوردی لە قوتابخانەکان چییە؟ پێتان وانییە وەزارەتی پەروەردە دەورێکی نێگەتیف دەگێڕێت لەبەرەو پێشەوە بردنی ئەم زمانە؟**

وەڵام/ جارێ پێش هەموو شتێك کتێبی (خوێندنەوەی کوردی) پۆلی یەکەمی سەرەتایی مامۆستای هەرە مەزن ئیبراهیم ئەمین باڵداری لێ دەرچێ هیچ کتێبێکی پرۆگرامی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی روون نیە و بە کەڵکی ئەوە نایێ منداڵی کورد فێری کوردییەکی جوان بێ، ئینجا چ جای زارەکان تێکەڵ بکرێن زیاتر سەر لە منداڵی کورد بشێوێنین. هەموو ئەمانە پێداچوونەوەیان دەوێ، هەڵبەت لە لایەن زمانزان و زمانناسی کوردی شارەزا ، ئێمە دەتوانین بۆ ئەوەی لە گرفت دەرچین زارێك بکەینە زمانی ستاندارد و گرینگیش بە ئەوانی تر بدەین. لە ناو هەموو میللەتێك وەزارەتی پەروەردە گەورەترین گرینگی پێ دەدرێ، لە لای ئێمە ئەو گرینگی پێدانە نیە و لەولاشەوە پارەیەکی زۆر بە خۆڕایی خەرج دەکرێ، هەموو شتێك بە سەقەتی دەخوێندرێ. پاشان دەبینم مەسەلەکە زۆر لەم ئاستە گەورەترە، حکومەتەکەمان خۆی هیچ فەلسەفەیەکی سیاسی بۆ زمانی کوردی نیە، ئێرە کوردستانە، ئێمە خۆمان بە کورد دادەنێین، بەڵام لە نوخبەیەکی بچووك بترازێ کەس رێز لە زمانی کوردی ناگرێ، هەموو خەڵکەکە بە سەقەتی زمانی کوردی بە کاردەهێنن، باسی کۆڕی زانیاری کوردت کرد، تا ئێستا نەیانتوانیوە فەرهەنگێکی کوردی کوردی دابنێن لەسەر ئاستێکی میللی بە سەر دەزگا و ناوەندەکانی حکومی و ناحکومی بڵاوی بکاتەوە و فەرزی بکات، بە هەمان شێوە وەزارەتی پەروەردەش نەیتوانیوە فەرهەنگێکی کوردی کوردی بۆ قوتابیان ئامادە بکا کە شتێکە دەبێ بە پلەی

یەکەم بکرێ. لەوانەیە هیچ زمانێك لە دونیا بە قەد زمانی فرەنسی ستاندارد نەبێ، لەگەڵ ئەمەش لە هەر مالێك و دەزگایەك و ناوەندێك، فەرهەنگێکی فرەنسی فرەنسی هەیە کە جێگای متمانەی دەستەلاتە و بە شێوەیەکی رەسمی ئەم فەرهەنگە فەرز کراوە و سەرچاوەیە بۆ هەموو لایەك، ئێمە دەتوانین سوود لە ئەزموونی میللەتان وەرگرین پێش باسکردنی کێشەی زمانی ستاندارد، جارێ با فەرهەنگێکی کوردی کوردی باشمان هەبێ حکومەت بە سەر هەموو لایەك فەرزی بکا ئەوسا باس لە هەنگاوی دیکە دەکەینەوە.

**پ/ تا چەند لەگەڵ ئەوەدان کە سۆرانی و کرمانجی بە بێ هیچ میتۆدو لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و بریاردانی ژیرانە تێکەڵ بەیەکتر بکرێن لە خوێندنی وانەی کوردی لە قوتابخانەکان؟**

وەلام/ دەشێ ئەمە تەنیا بە پلان بکرێ. من پێم باشترە منداڵانی کورد، هی ناوچە کرمانجییەکان لە سەرتایی بە زاری خۆیان بخوێنن، پاشان ئەمە نابێ بمێنێ، بەڵکو بۆ هەنگاوی دواتر بە پلان بۆدانان ئەم تێکەڵ کردنە سوودی لێ وەربگیرێ.

**پ/ ئەگەر سەیر بکەین لە دونیادا ناوەندێك هەیە بۆ دروست بوونی زمانی یەککگرتوو، بۆ وێنە لە ئیتالیا ناوەندی (تۆسکان) ئەو زمانەی دانتێ پێی دەنووسی، لە فەرەنسی( پاریس) لە ئیسپانیا ناوەندی (لا مانچا) کە سێرڤانتێس پێی دەنووسی و لە عەرەبیش قورئان و.... لە ناو کوردیش ئەو ناوەندە لەسەردەمی نوێبوونەوە دروست بوو لەگەڵ میرنشینی بابان و ئەردەلان، بەڵام بۆ زاری ئەو ناوەندە نەبوو بە زمانی یەککگرتوو؟**

وەلام/ ئەمە ڕاستە، بەڵام بۆ کوردی سەرەڕای ئەوەی زاری بابان کە ئێستا پێی دەگوترێ (سۆرانی) لەم سەد ساڵەی دوایی وەك زارێکی بەهێز خۆی سەپاندووە، کێشەی سیاسی و مێژووی کورد خۆی دەستی لەم بە ستاندارد بوونە هەیە، لە هەر سەردەمێك ناوەندێکی ڕۆشنبیری کوردی جیا هەبووە و ئەم ناوەندە زاری خۆی فەرز کردووە، ئەمەش مێژوویێکی هەیە، سەرەتای ئەم مێژووە

دەگەڕێتەوە بۆ زمانی پەهلەوی سەردەمی ساسانیەکان، پاشماوەی پەهلەوی ئێستا لە ناو کورد زاری فەیلییە، کە زۆر لە کوردان خۆیان ئەمە ئینکار دەکەن، لە کاتێکدا ئێمە دەزانین پەهلەوی هیچ پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە زمانی فارسی نیە، ئەگەر هەشبێ ئەو پەیوەندییە لەگەڵ کوردی و زارەکانی کوردی نزیکترە. پاشان زاری گۆران و ناوەندی فەرهەنگی گۆرانەکان دێ، ئینجا ئەم ناوەندە دەگوازرێتەوە بۆ باکوری کوردستان و زاری کرمانجی و هەکاری و زاری شاری جەزیرە وەك ناوەندی دەستەلاتی کوردی دەردەکەون. پێش سلێمانی و سنە، لە سەدەی حەڤدە شاری بەدلیس ناوەندی دەستەلاتی حکومەتی کوردستان بوو کە هەر لە سەدەی پانزەوە ئەم ناوەندە سەرهەڵدەدا تا دەگاتە سالأنی ١٦٤٧ و ١٦٤٨ کە دەستەلاتی میرەکانی بەتلیس لە ناو دەچێ. ئینجا لەگەڵ کۆتایی سەدەی هەژدە و سەرتای سەدەی نۆزدە شاری سلێمانی و سنە وەك ناوەندێکی سیاسی و فەرهەنگی کوردی نوێ سەرهەڵدەدەن کە تا ئەمڕۆش درێژەیان هەیە. لەم نێوانە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم ئەستەنبۆل وەك ناوەندێکی فەرهەنگی و سیاسی کوردی سەرهەڵدەدا، پاشان ئەم ناوەندە دەپووکێتەوە، ناوەندێکی دیکە لە یەریڤان و گورجستان سەرهەڵدەدا. دەتوانین بڵێین گەشەسەندن و پراتیك کردنی سۆرانی و کرمانجی هیچ کاتێك بە یەك ئاست گەشەی نەکردووە، کرمانجی لە چاو سۆرانی زۆرتر هەوراز و نشێو و پچڕانی تێکەوتوە، سۆرانی ئەمەی نەدیوە، هەر لەبەر ئەمەشە سۆرانی هەژموونی زیاترە، سادەتر بووەتەوە، زۆرتر لە بواری نوسین و مێدیا و کارگێڕی کاری پێ دەکرێ. بەڵام سۆرانی دەتوانێ هێشتا سوود لە زارەکانی تر وەربگرێ، ئەمەش دەشێ بە پلاندانان بکرێ.

**پ/ من مەبەستم لە سۆرانی زاراوەکانی(بابان، ئەردەلان، موکریانی، سۆرانی)کە بە کوردی ناوەراست ناسراوە، ئایا ناکرێت ئێمە بەو زارە هەموومان بنووسین بە مەرجێ بە زاراوەی دیکە دەوڵەمەند بکرێت؟**

وەلام/ منیش هەروای بۆ دەڕوانم، بێگومان ئەمە دەکرێ و ئاسانیشە، بەلام ئێمە پێشتر دەبێ زمانەکەی خۆمان بە هەموو زارەکانەوە خوشبوێ و ڕێزی بگرین، ئەم ڕێزگرتنەش بە کاری فەرهەنگی و زمانەوانی دروست و پوختە دەکرێ. ئیمڕۆ بە داخەوە من ئەم خۆشەویستییە نابینم، بە بەرچاومان زمانی کوردی دەشێوێنرێ کەسێك، دەستەلاتدارێك چیە لە شوێنی خۆی ناجوولێ. لە شارێکی وەك هەولێر کە ناوەندی دەستەلات و حکومەتی کوردستانە، خەریکە زمانی کوردی بزردەبێ، کۆنترۆلێکی زمانەوانی نیە، هەر کەسە و بە عەرەبی ناونیشانی پیشەکەی خۆی دەنووسێ، ئەمە لە ئیهانەکردنی کورد شتێکی دیکە زیاتر نیە.

**پ/ بزوتنەوەی رۆشنبیری و بووژانەوەی کولتوری بە سۆرانی نووسراوەتەوە، کورد ئەگەر بیەوێ وەك نەتەوەیەك بناسرێ ئایا پێویست بەوە ناکات دەوڵەمەندترین زاراوە هەلبژێرێ کە لە ڕووی تەکنیکی و کولتوری جێگیری هەبێ؟**

وەلام/ بێگومان، بەلام داخەکەم چ ڕۆشنبیران چ دەستەلاتی کوردی کەمتەرخەمن لە دروست کردنی ئەم گیانە نەتەوەییە، بۆ من جیاوازی لە نێوان فەیلی و گۆران و سۆرانی و کرمانجی و دەملی نیە، ئەمانە هەمووی زمانی کوردین، بەلام ناوچە پەرستەکان کورد بەرە و جیهانێکی تەسك و تریسك و بچووك دەبەنەوە. من پێرار کارم لە رۆمانە مەزنەکەی عەرەب شەمۆ کرد: رۆمانی شڤانێ کورد، ئەگەر هەر کەسێك ئەم ڕۆمانە مەزنە بخوێنێتەوە دەزانێ چەندە بە زمانێکی جوان و ڕەوانی کوردی نووسراوە، هەر لە ڕێگای ئەم رۆمانەش دەزانین جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان سۆرانی وکرمانجی نیە. ئەگەر جیاوازییەك هەبوایە پێویستیمان بە وەرگێڕ دەبوو. ئەوانەی بە کرمانجی دەنووسن دەتوان زمانی ئەم ڕۆمانە بکەنە سەرمەشقی نووسینی خۆیان، چونکە بە کرمانجییەکی زۆر مۆدێرن و پاراو نووسراوە.

**پ/ من لە ورووژاندنی ئەم پرسیارە بە هیچ شێوەیەك مەبەستی ئەوەم نییە دووبەرەکی و کێشە لە ناو کورد دروست بێ، بەڵام ئێوە دەربارەی ئەم دیاردەیە چی دەڵێن کە کوردستانی باکور زۆربەیان بە کرمانجی قسە دەکەن سەرەرای بوونی بن زاراوەی دیکە لە ناو کرمانجی خۆی لەو سەر بۆ ئەو سەری کوردستانی باکور بگەرێی ١٠ کەس نابینیەوە بە کوردی قسە بکا و بنووسێ، لە کاتێکدا ئێمە زاراوەیەکمان هەیە کە ئێستا قسەی پێ دەکرێ و دەنوسرێ و زمانی فەرمیە بۆ ناکرێ ببێتە بنەمایەکی بوژانەوەی کولتوری و سیاسی بۆ ئەوانیش؟**

وەلاّم/ راستە کوردی باکور کێشەی زمانیان زۆرە، دوایش ئەو زیندووبوونەوەی کرمانجی، کە زیاتر لەم سی ساڵەی دوایی کوردی دیاسپۆرا پێی هەڵسا، زیاتر بە کاریگەری سۆرانی بوو، ئەمەش واتە لێك نزیکبوونەوە، من لەو باوەڕەم سۆرانی باشتر دەتوانێ زارەکانی تر قووت بدا نەك بە پێچەوانەوە.

**پ/ نزیکەی ٧٠-٨٠ ساڵ لە کار پێ نەکردنی زاراوەی کرمانجی لە سەردەستی یان لە لایەن رۆشنبیرانی دیاسپۆرای کورد لە ئەوروپا جارێکی دیکە زیندوو کرایەوە، بەلام بنەما تەکنیکیەکە گەلێ جیاوازی هەیە، پێتان ئەستەم نییە کرمانجی ببێ بە زمانی یەکگرتووی کوردی و لە لایەن کوردی عێراق و ئێران بەکار بێت؟**

وەلاّم/ ئەمە راستە کرمانجی هەروەکو منیش لە سەرەوە گوتم ئەم پچڕانەی زۆر تێکەوتووە، ئەم زیندووبوونەوەیەش بە کاریگەری سۆرانی ڕاستە. بەلاّم ئێمە ئەگەر بمانەوێ نەتەوەیەك دروست بکەین، ئەوانەی سۆرانی قسە دەکەن دەبێ ئەو لێبووردەییە و ئەو گیانە نەتەوەیەیان هەبێ دەست بە هەموو زارەکانی کوردییەوە بگرن، چونکە ئەمە هەموو شتێکی کوردە. ئەوانەی سۆرانی قسە دەکەن و بە سۆرانی دەنووسن دەبێ سوود لە هەموو زارەکان و هەموو کەلەپوور و هەموو

سامانی فەرهەنگی کوردی وەربگرن، ئەوان دەبێ ئاودیوی ناوچەگەری و خۆ بچووك کردنەوە بن.

**پ/ یەکێ لە کێشەکانی دیکە کێشەی هەندێ زاراوەی دیکەیە لە ناو کورد کە فاکتەری ئاینی لە پشتەوەیە، وەك زاراوەی گۆران، هەورامانی، علی ئیلاهی، کەهوری، کاکەیی... کە لەبەر هەمان فاکتەری ئاینی لە رووی سیاسیەوە ئەستەم دێنە ناو بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی ، ئەوان چۆن دەتوانن بە کرمانجی بنووسن و بخوێنن ئەگەر هاتوو دەسەلاتی کوردی بڕیاریدا کرمانجی ببێ بە زمانی یەکگرتوو؟ چونکە ئێمە دەزانین خەلکی ئەم ئاینزایانە سۆرانی دەزانن و دەتوانن پێی بنووسن؟**

وەلام/ دەستەلاتی سیاسی قەت ناتوانێ ئەو بڕیارە بدا.

**پ/ بۆچی تا ئێستا نوخبەی سیاسی پرۆژەی ریفۆرمی زمانەوانی دەست پێ نەکردووە بە شێوەیەکی سەتاپاگیری؟**

وەلام/ چونکە نوخبەیەکی دواکەوتووە و تەنیا بە دوای ئارەزووەکانی خۆیانن. لە بنچینەدا نوخبەیەکی وا بوونی نیە، ئەگەر هەبوایە بزووتنەوەیەك دەبوو لەم بوارەوە.

**پ/ ئەگەر میدیای کوردی وەربگرین لە تەلەفزیۆن و رادیۆ و مالپەرەکان کە زۆربەیان لە کوردستانی عێراق پەخش دەکرێن، ئەمە هێزێکی داوەتە سۆرانی وێرای بوونی زاراوەکانی دیکە، بەلام پێ دەچێ هێشتا کورد نەیتوانیوە لەم رووەوە سود وەربگرێت یان بەلای کەمی هەندێ کێشە چارەسەر بکات؟**

وەلام / مێدیا و ڕاگەیاندن ئەگەر سوودی لێ وەربگیرێ باشترین هۆن بۆ نزیك کردنەوەی زارەکان. بەلام با پێشتر کورد، ناوەندە کوردییەکان زمانەکەیان خۆشبوێ و ڕێزی بگرن و ئەوەندە بریندار و دووچاری سەرلێشێوانی نەکەن.

**پ/ بە هۆی بوونی ئەو شەپۆلەی میدیا بە سۆرانی لــە کوردســتان و نــەبوونی ئەلتەرناتیڤی کرمانجی لە ماوەی رابردوو خەلکی کرمانجیش ناچاربوە گویٚ لــە سۆرانی بگریٚ و شارەزایی لە بارەیەوە پەیدا بکات، پێتان وانییە ئــەو ریٚگایــە ئاسانتر بێت بۆ بوونی سۆرانی بە زمانی یەکگرتوو، چونکە کرمانجی بەو شێوەیە نەیتوانیوە سود بە زمانەکە بگەیەنیٚ؟**

وەلاٚم/ ڕاســتە ســۆرانی لــەم ڕووەوە هــەنگاوی گــەورەی هاویــشتووە، بــەلاٚم کرمانجی و زارەکانی تریش زمانی کوردین.

**پ/ ئایا ئێوە لەو باوەرە دانین ئەگەر نوخبەی رۆشنبیری کوردی فەرهــەنگێکی ستاندارد دابنیٚ بە چەندین چاپ و قەبارەی جیاجیا و بە پێی یاسا و دەسەلاتی کوردی بریاری لەسەر بدات و بیکاتە سەرچاوەیەکی ستاندارد و لە لایەن هەموو کەسێکەوە بەکار بهێنریٚ، ئەمە یارمەتیدەر نییە لەو کێشە گەورەیەی هەمانە رزگارمان بکات؟**

وەلاٚم/ لە سالّی ۲۰۰۲ ەوە من لەم بارەیەوە دەنووسم، دەمێکــە، تــا ئێــستا سێ چوار جار گوتارم نووسیوە وەك پرۆژەیەك داوای فەرهــەنگی کــوردی ستانداردم کردووە، بەلاٚم با ناوەنــدە کوردییــەکان فەرهــەنگێکی ئەوەنــدە مــەزن دانەنیێن بەلکو شتێك بکەن ببێتە سەرمەشق.

**پ/ ئایا لەو بڕوایەدا نین کە ئەمە مەسەلەیەکی مێژوویی و چارەنووس سازە و کورد دەبیٚ خۆی بریار بدات و هەموو لایەك لەسەری رێکبکــەون و زاراوەیــەك هەلبــژێرن، چــونکە ئێمــە بووینەتــە قوربــانی مێــژوو ســەرەنجام کــورد دەبــیٚ چارەسەرێکی مێژوویی بدۆزێتەوە؟**

وەلاٚم/ ڕاستە، ئێستاش ئەم هەلکەوتــە مێژوویــە بــۆ کــورد هەلّنەکــەوتووە، ڕاستە بۆ ئێمە ئێستا لە باشور ئەو فرسەتە تۆزیٚ لە بارە، بەلاٚم نــەیارانی کــورد چاویان هەموو شتێکی کورد دەبینیٚ و هەردەم لە نشوستی پیٚ هێنانی دان، بەلاٚم ئەوەی کە تراژێدی ترە کورد خۆی هەموو شتێکی خۆی نابینیٚ. کێشەی مێژوویی

کورد، واتە کێشەی زمان و کێشەی بوون. لەم بارەیەوە دەسـتەڵات و ناوەنـد و نوخبە ڕۆشنبیرەکانی کورد لە گەڕان و خەباتی چارەنووساز، ئیتر چ زمان بێ یـان کێشەی سیاسی نابێ  بە موجامەلـە و سـووکی سـەیری بکـرێ، ئێمـەی کـورد پێویستیمان بە زیندووبوونەوە هەیە، زیندووبوونەوەیەکی مێژوویی، ئەمـەش بـە هێز و ئیرادە و کارکردن دەکرێ نەك بە مانەوە لە ناو خەون و ئاواتی زاتـی، کـە ئەمڕۆ بە ڕای من ئەم دیاردەیە لە ناو کورد باوە. مەسەلەی زمان مەسـەلەیەکی سیاسییە، ئەمەش ستراتیژی و ئامانجی فەرهەنگی و سیاسی دەوێ.

**پ/ لەبەینی کوردی باکور و باشور و ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا ئـەمڕۆ هەسـت بـە جیاوازی سیاسی و کولتوری دەکرێ، لەو بڕوایە دانین نوخبەی سیاسی کورد بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشانە ئەمڕۆ لەسەرووی هەموو ئەو جیاوازی و کێـشانە بێت؟**

وەلاّم/ بێگومان دەبێ وابێ، بەلاّم نوخبەی سیاسـی کورد بەرانبەر بە کێـشەی زمان خەوتووە !

**پ/ ئەو جیاوازیە سیاسی و کلتوریانە کە بە کاریگەری جیۆپۆلەتیکی مێژوویی لە کوردستان دروست بوونە درێژە یە هەمان کێشەکانی زمانی کوردی دەدەن و سەرەنجام زمانێکی یەکگرتوو دروست نابێت؟**

وەلاّم/ لەو باوەڕەدام ئەم جیاوازیانە تا ماوەیەکی نادیار بەردەوام دەبن، بەلاّم ئێـستا ئێمـە سـەروکارمان لەگـەلّ کوردسـتانی باشـوورە، ئێـرە دەشـێ ببێتـە ماتۆڕێکی بە هێزی کولتووری و زمانەوانی و سیاسی، بێگومان هەر واشە، لـەو باوەڕەم دەستەلاّتی حکومەتی هەرێم، وێڕای ناوەند و دەزگاو نوخبەی ڕۆشـنبیران لەم بارەیەوە خێراتر و بە گوڕتر کار بکەن، چونکە ئێمە بە پاش کەوتووین و زۆر شتمان بەسەردا تێپەڕیوە. دەبێ فەلـسەفەیەکی سیاسـی و فەرهـەنگی ڕوونـتر و هێرشبەرتر بکرێتە پڕۆگرامی کـارکردن. ئێمـە پێویـستیمان بـە زیندووبوونـەوە هەیە.

**پ/ کوردی باکور هەردەم ئەوە دووپات دەکەنـەوەو دەلـێن زۆربـەی کـورد بـە کرمانجی قسە دەکەن، ئەمە تا رادەیەك راستە بەلاّم ئایا ئەم زۆربەیـە کـە بـە**

**درێژایی ٨٠ ساڵی رابردوو بە سیاسەتی تواندنەوە ژیاوەو زمانی خۆی لەبیر کردووە پێی بنوسێ و بخوێنێ چۆن دەکرێ ببێتە زمانی کوردانی باشور و رۆژهەلات کە نەکەوتوونەتە بەر سیاسەتی تواندنەوە؟**

وەلأم/ ئەمە ڕاستە، هیچ کاتێك بوونی زارێك یان زمانی ناوچەیەك زۆری قسە پێ کەرانی مەرجی بوون بە ستاندارد بوون ناگەینێ، ستانداربوون هێزی فەرهەنگی و سیاسی دروستی دەکا، ئەم هێزە ئەمڕۆ لە سۆرانی هەیە، بەلأم لە زارەکانی دیکەی کوردی نیە، بەلأم زارەکانی دیکەش کوردین و کوردیش لە حاڵەتێکی سیاسی و فەرهەنگی ناستاندارد و نالەبار دەژێ بۆیە، مانای ئەوە نیە زارەکانی تر دەبێ لە ناو ببرێن، نەخێر، ئێمە بۆ دروست کردنی زمانی نەتەوەیەك دەبێ هەموو ڕێگایەك تاقی بکەینەوە.

**پ/ ئەلف و بێ هۆکارێکی زۆر مەزنە بۆ لە یەکتر نزیکبوونەوە، پێتان وانییە کورد دەبێ سەرەتا ئەو کێشەیە چارەسەر بکات ئینجا بێت کێشەی زمانەکە چارەسەر بکات؟**

وەلأم/ من بە ڕاشکاوانە دەڵێم من لەگەڵ بەکارهێنانی ئەلف و بێی لاتینیم، من پێم باشە هەموو کورد یەك ئەلف وبێ بەکاربهێنێ، ئەم ئەلف وبێیەش دەبێ لاتینی گونجێنراو بێ بۆ زمانی کوردی. ئەلف وبێی عەرەبی تەنیا بۆ زمانی عەرەبی باشە، بێگومان یەکگرتنی ئەلف وبێ بۆ زمانی کوردی وەك هەنگاوی یەکەمی ستاندار بوونە. ئەلف وبێی عەرەبی لە مانەوە لە ناو دواکوتوویی زیاتر نیە، ئەلف و بێی لاتینی ئاسۆیەکی تری فراوانتر بۆ کوردی دەکاتەوە. ڕەنگە زۆر کەس هەبێ دژی ئەم ڕایەی من بێ، ئەمەیان شتێکی ئاساییە ئەگەر بۆمی بسەلمێنن ئەلف و بێی عەرەبی گونجێنراو بۆ کوردی سوودەکانی چین لە ئێستا و ئاییندە. بەلأم من لە قەناعەت و ڕوانگەیەکی فەلسەفەیەکی سیاسی تایبەت بە خۆم قسە دەکەم، روانینی من عەلمانی دیمۆکراسییە، من دژی ئەلف و بێی عەرەبیم، من لەگەڵ نوێخوازی دام، دەمەوێ لە ڕێگای بەکارهێنانی ئەلف و بێی لاتینی (یەك ئەلف و بێ بۆ هەموو کورد) کورد بچێتە ناو سەردەمێکی دیکەی

مێژوویی، ناو سەردەمێکی دیکەی زمان و زمانی نوێخواز، ئەمە بۆ خۆی ڕاستە لێدانێکی گەورەیە لە کەلەپوور، بەڵام هەر ئەمڕۆ کورد پێویستی بەم ڕووخاندنی کەلەپوورە هەیە، بۆ ئەوەی کەلەپوورێکی تری نوێخواز بنیات بنێتەوە. کورد لە هەموو میللەتێك زیاتر پێویستی بە نوێبوونەوە هەیە، هەتا ئێمە ئەم ئەلف و بێیە بەکاربهێنین فیکری ئایینیی دۆگماتیك و فکری پڕوپوچ لە ناو کورد درێژە بە خۆیان دەدەن. ئەسلەن هەر فیکری پڕوپوچە مرۆڤی کوردی ئیفلیج کردووە، ئەمەش لە ناو کورد شێوەیەکی سەرتاپاگیری وەرگرتووە، لە سیاسەتەوە بگرە تا دەگاتە پەیوەندی نێوان ژن و پیاو. لەم کوردستانە فیکری پڕوپوچ و نەبوونی ئایدیا و فەلسەفەیەکی سیاسی ڕۆشن کە گەلی کورد بگەیەنێتە ئاسۆ وای لە کورد کردووە لە ناو خەوتنێکی مێژووییدا بژیێ، پێش هەموو کەسێك، نوخبەی ناسیۆنالیست (ئەگەر هەبێ) لە ناو خەوێکی مێژووییدا نغرۆ بووە. بە داخەوە ئەو نوخبە ناسیۆنالیستەی من بۆی دەچم (کە دەبێ عەلمانی و دیموکرات و پلورالیست و نیشتمان پەروەر و ڕۆشنبیر بێ) کە لە ناو کورد لاوازە، ئەوەی کە هەشە بەرانبەر بەم خەوە مێژووییە بێ ئاگایە. نرخی زمان و نوێبوونەوە و ئایندە نازانن.

**پ/ بۆچی دەسەلاتی سیاسی کوردی کێشەی زمان و بەکارهێنانی زمانی کوردی بە فشە وەرگرتووە؟ ئەمە مانای چییە؟ ئایا دەسەلاتی سیاسی کوردی لە مێژوو تێ ناگات؟**

**وەڵام/** دیارە تێ ناگا، ئەمەش هەر بۆ خۆی کارەساتێکە. ئیمڕۆ زمانی کوردی هەر کەس بە ئارەزووی خۆی بە کاری دەهێنێ. زۆرجار گوتوومە چەند کورد لە جیهاندا هەیە ئەوەندە زمانی کوردی هەیە. بە داخەوە مێژوو لەگەڵ ئێمە زۆر دڕندە بووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کورد لەگەڵ خۆشی دڕندە بووە. لە کاتێکدا لە جیهاندا نزیکەی شەش سەد ملیۆن کەس بە زمانی فەرەنسی قسە دەکەن، بەڵام هەر هەموویان بە یەك زمان قسە دەکەن. ئەمەش پێچەوانەی ئەو حاڵەتەیە کە لە نێو کوردا هەیە.

**پ/ مەریوان لە بارەی زمانەوە لە وتارێکدا کە باسی ئەفکارەکانی ئەرنست ڕێنان دەکا، باسی لەوە کردبووکە بچینەی ناسیۆنالیزم بریتیە لە. زمان و خاك و مێژوو. لە کاتێکدا دەبینین ئەوەی جەوهەریە لە ناسیۆنالیزم لە ڕوانگەی ئەرنست ڕێنان بڕیاردانی بەیەکەوە ژیانی کۆمەڵە خەلکانێکە، واتا ڕێککەوتن و بوونی کارەساتی هاوبەش لە مێژوو. لێرە زمان دەبێ بە شتێکی فەوقی و پاشان دروست دەبێ، کەواتە لای ئەرنست ڕێنان زمان پەیوەندی بە ئیرادەیەکی ماددیەوە هەیە و کۆمەلە خەلکانێك پێشتر بڕیاریان داوە بەیەکەوە بژین و ئینجا دواتر زمانێك هەلدەبژێرن، کەواتە زمان هۆکارێك نییە لەوەی کۆمەلە خەلکێ بەیەکەوە بژین. سەرچاوەی ئەو ڕووانینە سمینارێکی ئەرنست ڕێنانە بە ناوی(نەتەوە چییە) ئەوە ناسراوترین کێشەیە دەربارەی نەتەوە. زمان هۆیەك نییە بۆ دروست بوونی نەتەوە بەلکو ئەنجامێکی پێکەوە ژیانە.**

وەلأم/ ئەمە ڕاستە مەریوان وریا قانیع لەم ڕووەوە بە سەهو چووە، ئەمانە پەخشان دەنووسن تاقەتیان نیە بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکان. لە لای ئەرنست ڕێنان نە زمان نە خاك نە بەرژەوەندی هاوبەش و نە ئایین هۆکارێك نین بۆ دروست بوونی نەتەوە و مەرجی ناسیۆنالیزمیش نین. ئەوەی نەتەوەیەك دروست دەکا، بڕیاری بە یەکەوە ژیانە، بوونی ڕابردووی هاوبەش و درێژبوونەوەی ئەم ڕابردوو و ئەم بەیەکەوە ژیانەیە بەرەو ئاییندە، هەروەها ئامادەیی لە بیرکردنی کارەساتەکانی ڕابردوو و قوربانیدان لە پێناوی یەکتر....هتد. ئەمانەن فاکتۆری سەرەکین لە دروست کردنی نەتەوەیەك، چونکە هیچ نەتەوەیەك لە یەك نەژاد پێك نایێ، بەلکو هەردەم کۆمەلێك نەژاد بەیەکەوە دوای لەبیرکردنی ڕووداوە خوێناوییەکانی نێوانیان یەکتر دەگرن و نەتەوەیك پێك دەهێنن. چونکە مرۆڤ هەردەم بیری لە هێزکردۆتەوە، بڕیاردانی بەیەکەوە ژیان هێزی زۆرتر بەرهەم دەهێنێ، ...هتد. زمان بە پلەی دووەم دێ، زمان وەك ناسنامە دێتە بەرچاو نەك جەوهەری پێکهێنەر.

**پ/ کورد بۆ ئەوەی وەك نەتەوەیەك بناسرێ پێویست نییە زمانێکی هەبێ؟**

**وەلأم/ بێگومان.**

**پ/ ئاکرێ چەندان دیالێکت هەبێ و یەکێ بۆ زمانی ستاندارد هەلبـژێردرێت و ئەوانی دیکەش دیالێکتی میللی بن بۆ قسە کردن؟**

وەلام/ هەڵبەت ئەمە دەکرێ، بـەلاّم زمـانی سـتاندارد دەسـتەلاتی بـەرز و خەملیوو و پێگەیشتوو دروستی دەکا، ئەم دەسـتەلاتەش خـۆی لـە دەسـتەلاتی سیاسی و فەرهەنگی دەبینێتەوە. بە داخەوە هێشتا ئەم دەستەلاتە پێگەیـشتووە لە ناو کورد دروست نەبووە، ئێمە نەك هەر لە بواری سیاسی یەککرتوو نـین، لـە بواری فەرهەنگیش یەککرتوو نین، ئێمە کێشە و شتەکانی خۆمان خـۆش نـاوێن، ئەمەش سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دواکەوتوویی کورد و ئەو چەوسـاندنەوانەی بینیوویەتی. ئێمە پێویستیمان بە یەکگرتن و زیندووبوونەوە هەیە.

**پ/ ئەگەر سەیر بکەین لاف لێدانی رۆشنبیری لە ناو چینی رۆشـنبیرانی ئێمـە هەیە، لە جیاتی بە جدی کێشەکانی مرۆڤی کورد باس بکەن و وەك خـۆی کـە هەیە ئیتر زمان و ئاین و کۆمەل ... باس لەو شتانە دەکەن بە رستەو شێوازێك تەنیا بۆ خۆ پیشاندانی خۆیان لە کاتێکدا گەلی کورد پێویستی بە خۆ بەخشی کارکردن و قوربانی هەیە، ڕوانینی ئێوە لەم بارەیەوە چییە؟**

وەلام/ ئەم دیاردەیەم هەست پێ کـردووە، ئـەم لاف لێدانـە ڕۆشـنبیرییە لـە ئارایشێکی درۆزن زیاتر نیە، بەرگێکی جوانە سەرچاوەکەی نـەزانی و بـە هەنـد وەرنەگرتنی شتەکانە، سووك سەیرکرنی خۆیە بێ ئەوەی ئەو کەسە هەسـتی پـێ بکا. بە داخەوە ڕۆشنبیرانی کۆنمان لەم ڕووەوە سادەتر و روونـتر بـوون، ئەمـەش مانای ئەوە نیە ئێمە دەبێ بۆ شتە باشە لە ناوچووەکانی رابردوو بگرێین، نەخێر، بەلکو مەبەست لەمە، ئەوەیە ئێمە زۆرمان ماوە بگەینە ڕیزی میللەتانی زیندوو و بە ئاگا، ئێمە قوربانی و کارکردنی زۆری پلان بۆ دانراومان پێویستە.

دیمانە: عەلی سدیق

## ڕوانینێکی تر بۆ ڕەخنە و ئەدەبی نوێ ...
## گفتوگۆ لەگەڵ د. موحسین ئەحمەد عومەر

**پ/ پێتوایە لە ڕووی مێژوویەوە ئەو توێژینەوانەی تایبەتن بە ڕەخنەی ئەدەبی کوردی تا ئێستا توانراوە هەنگاوی باش بنرێت؟ بە واتایەکی تر، ڕەخنەی ئەدەبی کوردی لە ڕابردوو بە بەراورد بە ئێستا لە چ ئاستێکدا؟ واتە بەگشتی دەمەوێت بۆچوونتان لەسەر ڕەخنەی ئەدەبی کۆن، هەروەها ڕەخنەی ئەدەبی نوێ بزانم؟**

وەڵام : توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی بابەتێکی تازە و نوێیە، سەرهەڵدانی پەیوەندی بە مۆدێرنیزم و نوێبوونەوەوە هەیە، ئەمڕۆ یەکێکە لە خەسڵەتەکانی مۆدێرنیتی – Modernité ، وەك داواکارییەکیشە بۆ پێویستییە تازەکانی کۆمەڵگەی نوێ. سەرهەڵدانی لە ئەدەبی جیهانی، بە تایبەتی لە ئەدەبی ڕۆژئاوا، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نوێبوونەوە، واتە سەرەتای سەدەی نۆزدەم، بەلاّم هەنگاوی بەرفراوان لەم ڕووەوە لەگەڵ مۆدێرنیزم سەرهەڵدەدا، ئەمەش کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم دەگرێتەوە تا ئەمڕۆ. لەم ڕووەشەوە هەردەم بە دوو ئاراستە هەنگاوی هەڵێناوە، لە ناو زانکۆکان وەك دەزگای لێکۆڵینەوە، لە دەرەوەی زانکۆکانیش، لەم ڕووەوە ڕۆلان بارت Rolan Barthes ، لە گوتارێك بە ناوی "دوو ڕەخنە- Les deux critiques " باس لەم دیاردەیە دەکات چۆن ئەم دوو ڕەخنەیە گەشەیان کردووە، وێڕای دەست نیشانکردنی تایبەتمەندی خۆیان. بەلاّم لە ئەدەبی کوردی لێکۆڵینەوە زۆر تازەیە، ئێوە دەزانن ئێمە تا چەند دەیەیەك پێش ئێستا نە زانکۆمان هەبووە نە دەزگای زانستی بتوانێ لێکۆڵینەوە پێشکەش بکا، ئەمەش پەیوەندی بە کورد خۆیەوە هەیە، لەم ڕووەوە ناشێ ئێمە باس لە کێشەی سیاسی کورد نەکەین کە

فاکتەرێکی سەرەکییە لە نوێبوونەوە و گۆڕان، سەرەڕای ئەو پێشکەوتنانەی بەم ناراستەیە لە ناو کوردی ئەم پارچەیە ڕوویانداوە، هەندێ سەرەتای لێکۆڵینەوە و توێژینەوە هەیە، هەرچی پەیوەندی بە بەشی یەکەمی پرسیارەکەتانەوە هەیە، لە سالانی سیەکان و چلەکان و پەنجاکان، تا دەگاتە حەفتاکان، زۆر گوتاری (مقالە "Essai- ڕەخنەییمان هەن، ئەمانە ناشێ هەمووی بە یەك چاو سەیر بکەین، بۆ نموونە لە گەلاوێژ زۆر گوتاری ڕەخنەیی جوان هەیە، ئەوەی تر هەمووی بریتییە لە ڕوانینێکی میللیانە بۆ خوێندنەوەی ئەدەب و شیعر و پەخشان، بە گشتی کێشەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە وەك کێشەی ڕۆمان وایە لە ئەدەبی کوردی، هەڵبەت ئەم ڕوانینە بۆ ئەدەبی عەرەبی و فارسی و تورکیش ڕاستە، وێڕای لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندی ئەمانەی دوایی و زیاتر پێشکەوتنیان لە چاو کورد، بەو مانایەی ئەوان کێشەی سیاسی ئالۆزیان نەبووە وەك کورد. هەروەکو چۆن ڕۆمان بە جۆرێکی ئەدەبی ڕۆژئاوایی سەیر دەکرێ، بە هەمان شێوە لێکۆڵینەوەش بە دیاردەیەکی ئەدەبی ڕۆژئاوایی سەیر دەکرێ. لێکۆڵینەوە و توێژینەوە کۆمەلگەیەکی ئالۆز و قورس و سەنگینی دەوێ لە ڕووی بونیادی کۆمەلایەتییەوە، کۆمەڵی ئێمە لەم ڕووەوە هێشتا سادە و ساکاری پێوە دیارە لە چاو کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا.

**پ/ ئەو تیۆر و میتۆدە نوێیانەی هەنووکە هەن لەسەر ئاستی جیهان بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ڕەخنەگرانی کورد توانیوویانە سودی لێوەربگرن؟**

وەلام : لەو باوەڕەم هیچ ڕەخنەگرێکی کورد تا ئێستا نەیتوانیوە سوود لە تیۆر و میتۆدە نوێیەکانی ڕەخنەی ئەدەبی و فیکری وەرگرێ،(لەمەش مەبەستم زیاتر میتۆد و تیۆرە ڕۆژئاواییەکانە) ئەم لایەنە زۆر بە لاوازی لە ناو کورد گەشە دەکا، هەڵبەت دەزانین هۆکارەکان چین، چونکە هیچ کاتێك کورد، مرۆڤی کورد لە پەیوەندییەکی سروشتی و ئاسایی و کراوەدا نەبووە لەگەڵ جیهان، ئێمە بە چاوی خۆمان لەم چەند ساڵەی دوایی بینینمان، بە هۆی ڕووداوە سیاسی و وەرچەرخانە سیاسییەکانی جیهانی و هەرێمایەتی زۆر گۆڕان لە جیهان و

کوردستان ڕوویاندا، بە هۆی لە ناوچوونی دیکتاتۆرەکان، زۆر دەرگا لەسەر کورد کرانەوە، ئەمەش سوودی تایبەتی بۆ کورد هەبوو. ڕەنگە ئەم سوودانە هێشتا نەکەوتبنە بوارێکی جێگیر، بەلاّم لە ئایندەیەکی دوور یان نزیك کاریگەرییەکان لە ناو ڕۆشنبیری کوردی بە گشتی و ئەدەب و ڕەخنە و فکر بە تایبەتی دەردەکەون. لە لایەکی تر هەموو ئەو لێکدانەوەی سەرەوە بۆ ئەوەمان دەباتەوە لەبەر داخراوی دەرگاکان بەسەر مرۆڤی کورد، کورد هیچ کاتێك نەیتوانیوە سوود لە سەرچاوە زیندووەکانی فیکری جیهانی وەرگرێ. بۆ نموونە ئێمە تا ئێستا نەمانتوانیوە (فەرهەنگێکی کوردی کوردی دەوڵەمەند و پوختە) بۆ مرۆڤی کورد بەرهەم بهێنین چ جای سوود وەرگرتن لە سەرچاوەکانی جیهان. سەرەڕای هەموو ئەمانە هەست دەکەم کۆمەڵی ئێمە زیندوویتییەکی تێدایە، ئەگەر وەك مرۆڤێکی سروشتی سەر ئەم جیهانە بژی، دەشێ شارستانیەکی زیندوو دروست بکاو ببووژێتەوە.

**پ/ پێتوایە بوونی ئەو هەموو تێکستە ئەدەبییەی لە ڕابردوو بۆ ئێمە جێماون، تاچەند گرنگە ڕەخنەگر ئەو تێکستانە بخاتە بەر تیشکی ڕەخنەوە لە ئێستا؟ تاچەند تێکستە ئەدەبیەکانی هەنووکە ڕێگەخۆشکەرن بۆ فەرامۆشکردنی تێکستە کۆنەکان بەرامبەر ڕەخنەی ئەدەبی؟ یان بەپێچەوانەوە؟**

وەلاّم : من هەست دەکەم هەموو مێژووی ئەدەبی کوردی وەك گۆڕەپانێك وایە دەتوانرێ کاری نوێی لەسەر بکرێ، وەك زەوییەکی بەیار وایە دەتوانی بە ئارەزووی خۆت بیکێڵی، لە بنچینەشدا من خوێندنەوە و پلانی تایبەت بە خۆم هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە سەرجەم ئەدەبی کوردی، ڕیگرتن و فەرامۆشکردن نیە لە ئەدەب، نووسینێك ئەگەر جوان و نایاب بێ، ئەگەر لەسەردەمی بابیلۆنییەکانیش نووسرابێ هەر جوان و نایابە، کەس هەیە بڵێ "نالی" شیعری خراپی نووسیوە، کەس هەیە بڵێ "بێسارانی" شاعیرێکی ناسك نەبووە، بەلاّم تێکستێك ئەگەر خراپ بێ هەر بە خراپی دەمێنێتەوە، ئەمە وەکو کوفر وایە ئەگەر بە تێکستێکی نایابی بەراورد بکەی. پاشان تێکستی خراپ قەت مێژوویێکی نابێ.

لەم ڕووەوە دەبێ سەرنجی بەرهەمهێنانە تەواو کامل و پڕەکانی ناو ئەدەبی کوردی بدەین، هەر ئەوانەن کە دەبنە خۆراکی لێکۆلینەوە و توێژینەوە، ئێمە زۆر شاعیر و نووسەرمان هەیە، بەلاَم ئەزموونی کامل و پڕیان نیە، بۆ نموونە لەسەدەی نۆزدە، نالی و حاجی قادری کۆیی، ئینجا شێخ ڕزا بە ئەزموونی سەرەنجڕاکێش دادەنرێن، پاشان گۆران و شێخ نووریمان هەیە، بەلاَم شاعیرێکی وەك "هەردی" ئەگەرچی شیعری جوانی هەیە، بەلاَم لە ڕوانگەی من ئەزموونێکی پڕ و تەواوی نیە، دەتوانم دەیان شاعیری تری لەم جۆرەت بۆ ریز بکەم وەکم : دیلان، موکری، شەونم، ابراهیم ئەحمەد، شارباژێری،...هتد، ئەمە تەنیا نموونەیەکە. سەرەنجام هەر ئەمڕۆ تێکستی ئەدەبی نوێ دەنووسرێ، هەڵبەت نوێ لە ڕووی زەمەنەوە، بەلاَم هێشتا بە تەواوی نەکەوتوونەتە سەر کاغەز مردوون، لە ناو ئەمانەش دەتوانم دەیان شاعیر و نووسەرت بۆ ڕیز بکەم. بە گشتی داهێنان کارێکی سەختە و ژیان مردنێکی ڕۆژانەی دەوێ، ئەمەش هەموو بوارەکانی ئەدەب دەگرێتەوە.

**پ/ ڕەخنەی ئەدەبی کوردی لە ئێستادا لەچ ئاستێکدایە، دیارە ئەم پرسیارە بۆ ئەوەی تایبەت بکرێتەوە، دەمەوێت لە چەندیەتی دەربچمو لە چۆنیەتی بپرسم؟**

وەلاَم: کێشەی سەرەکی ئەوەیە ڕەخنەی ئەدەبی کوردی لە ناو هەژارییەکی تیۆری و زانستی دەژیێ، ئەوەی دەنووسرێ لە ڕوانگەیەکی ڕۆشنبیری نووسراوە، هەڵبەت هەندێ کەس هەن جوان دەنووسن، پوختە دەنووسن، بەلاَم بە شێوەیەکی گشتی ئێمە نەمانتوانیووە سوود لە سەرچاوەی جیهانی و ئەزموونی جیهانی وەرگرین، هەڵبەت بە شێوەیەکی دروست و پوختە نەك وەك لاسایی کردنەوە و لاف لێدان، کە ئەمەی دوایی تا ڕادەیەك بۆتە مۆدێك لە ناو کورد، ئەدەب تەنیا لە لای ئەوانە هەیە کە بە وشیارییەکی قووڵی فیکری و هونەری و ئەدەبی دژەمۆدن، نوێخوازی و داهێنان کارێکە زۆر بە سەختی هەستی پێ دەکرێ، زیاتر ئایندە ئەم لایەنە ساغ دەکاتەوە،

**پ/ ئەو لێکۆڵینەوە ئەدەبیانەی هەنووکە لە زانکۆکان ئەنجام دەدرێن، تاچەند هۆکارێکن بۆ گەشەسەندنی ڕەخنەی ئەدەبی؟ پێتوایە ئەو هەوڵانەی لە زانکۆکان دەدرێن لە ئاستی پێویستدایە؟**

وەڵام: ئەو هەوڵانەی لە زانکۆکان دەدرێ سەرەڕای خراپییان لە وانەی دەرەوە باشترن، هەر هیچ نەبێ ئەمانە بێ پلان و نەخشە و هەڵە و پەڵە نەنووسراون، ئینجا کێشەکە لێرەوەیە، لە ناو بەرهەمهێنانەکانی ناو زانکۆ و دەرەوەی زانکۆ هەژارییەك و سەرلێشێواوییەك هەیە، لە بنچینەدا هەروەکو "ڕۆلان بارت" دەڵێ ئەم دووە دەبێ هەردەم وەك تەواوکەری یەکتر بن و سەرەنجام بگەنەوە یەك خاڵ، بەڵام لە لای ئێمە هێشتا کوێرەوەری و هەژاری فیکری و ڕۆشنبیری هەیە.

**پ/ پێتوایە خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی تێکستە دێرینەکانی شاعیرانی کورد، لەڕێگەی ئەو میتۆدە نوێیانەوە تاچەند گونجاوو شیاوە؟ واتە ئەتوانین تێکستە دێرینەکان بەمیتۆدی نوێ بخوێنینەوەو دیوە شاراوەکانی تێکستی پێ بخەینە ڕوو؟ ئایا تێکستەکان خۆیان ڕێگەی ئەوە بە ڕەخنەگر دەدەن بە میتۆدی نوێ ڕاڤەبکرێن؟**

وەڵام: بێگومان ئەم کارە دەکرێ، پێویستیشە ئەم کارە بکرێ، هەر نەوەیەك دەبێ جێ پەنجەی خۆی لە خوێندنەوەی کۆن و نوێ دیاری بکا، لە بنچینەدا دەبێ هەموو شتێك بە ئاراستەی ئایندە بڕوات، بەڵام ئایندەی ئێمە هێشتا لە ڕابردووە، مەبەستم لەمە زۆر ڕوون ئاشکرایە، ئێمە دەبێ سەرلەنوێ خوێندنەوەی خۆمان بۆ سەرجەم ئەدەبی کوردی هەبێ، لەمەش جارێکی تر، مەبەستم لەم سەرجەمە تەنیا ئەو بەرهەمانەیە کە وەك داهێنان خۆیان پێشکەش دەکەن، ئەزموونی پڕن، بە گشتیش ئەدەبی کۆن و نوێی کوردی زۆر کەم کاری لەسەر کراوە، وەك مادەیەکی خاو دێتە بەرچاو، بواری لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی لە ڕوانگەیەکی تازە و نوێخوازانە گەلێك زۆرە،

**پ/ ئەو هەوڵانەی دراون لە خوێندنەوەی دەقی ئەدەبی بە میتۆدە نوێیەکانی وەك (بونیادگەری- هەڵوەشاندنەوە- ڕاڤەکاری (هێرمێنوتیك..) زۆر کەمن، تاچەند**

**گرنگە ڕەخنەگری کورد شارەزای ئەم میتۆدانە بێت، سود لەم میتۆدە نوێیانـە ببینێت‌و دەستبەرداری میتۆدە کۆنەکان بێت؟**

**وەلآم :** بێگومان ڕەخنەگری کوردی ئەمڕۆ ناتوانیٚ وەك عەلائەدین سەجادی، یان وەك مارف خەزنەدار بنووسیٚ، ئەمانـە سـەرەڕای ئـەوەی بایـەخی زۆری خۆیـان هەیە، لەگەلٚ ئەمەش هەست دەکەین ئیمڕۆ سەردەمێکی ترە، مرۆڤی کـورد لـە کوردستانی عێراق، سەرەڕای بەرتەسکی هێشتای کاریگەربوون بە سەرچـاوەکانی جیهان و ئەزموونی جیهانی، سەرەڕای بەربەستی سیاسی و نەبوونەوەی هێـشتای تەواوی دەرگاکانی جیهان بە ڕووی مرۆڤی کورد و نەتەوەی کورد، لەگەلٚ ئەمەش دەبینین ئێمە کەوتووینەتە ناو هاوکێشەیەکی تـازەی کاریگـەربوون بـە جیهـان، بێگومان دەشیٚ ئێمە سوود لە گشت ئەم میتۆدە نوێیانەی ئەدەبی جیهانی وەك : سـتـرەکتوراليزم Structuralisme (بونیادگـەری) دیکۆنستروکـسیۆن Deconstruction (هەلٚوەشـانەوەخوازی) میتـۆدی هێرمێنوتیکـا Hermeneutique وەرگرین، بەلآم کێشەکە ئەوەیە ئەدیبی کورد، توێژەری کورد، ڕۆشنبیری کورد تا ئێستا نەیتوانیوە سەرچـاوەکانی ئـەم ڕۆشـنبیرییە بـە شێوەیەکی دروست و پوختە و بیٚ هەلٚە و پەلٚە بگوازێتەوە ناو ئەدەبی کـوردی و ڕۆشنبیری کوردی بە گشتی. کێشەی ئێمە لەوەدایـە بـە پـوختی کـار ناکـەین، جۆرێك لە ڕوانگەی ڕۆشنبیری و خێرا بەسەر مرۆڤـی کـورد زالـە، پاشـان ئێمـە ڕەنگە زۆر پێویستیمان بەمانەش نەبیٚ، هەلٚبەت ئەگەر لە ڕوانگەیـەکی ئـەدەبی کوردی خۆی بڕوانین، ئێمە دەبیٚ لە ناوەوە بۆ ناوەوە کار بکـەین، واتـە بـە دوای خەسلٚەتی کوردیدا بگەڕێن هەلٚبـەت لـە ڕوانگەیـەك و خوێندنەوەیـەکی تـازە و نوێخواز.

**پ/ پێتوایە چەقبەستنێك (دۆگماییەك) هەبێت لەڕەخنەی ئـەدەبی کوردیـدا؟ تاچەند ئەم میتۆدە نوێیانە کار ئاسانیمان بۆ دەکەن بۆ دەرچون لەم چەقبەستنە؟**

وەلآم : ئەوەی کە بۆتە دۆگما لە ناو ئەدەبی کوردی کـوێرەوەری زانـستییە، زۆر کەس بە ڕۆشنبیرییـەکی زۆر کـەم خۆیـان لـە قـەرەی بابـەتی زۆر ئـالٚۆز دەدەن،

کێشەکە لەوەدایە ئێمە سەرنجی ناوەوەی خۆمان نادەین، ئێمە گوێ لە خۆمان ناگرین، ئێمە لە خۆمانەوە و لە توانای خۆمانەوە هەنگاو نانێین، هەموو میتۆدێك ئەگەر بە شێوەیەکی قووڵ و زانستیانە کاری لەسەر بکرێ و سوودی لێ وەربگیرێ دەشێ وەك ڕوانگەیەکی نوێ بۆ خوێندنەوەی تازەی ئەدەبی کوردی و ڕۆشنبیری کوردی بە کاربهێنرێ. بەلاّم ئەم لایەنە لە ناو ئێمە زۆر لاوازە، بۆ نموونە دەشێ لەم حالّەتەدا وەرگێڕان زۆر سوودی هەبێ بۆ هێنانی ئەزموون و سەرچاوەکانی جیهانی بۆ ناو کورد، بەلاّم وەرگێڕانی پوختە لەم بارەیەوە زۆر کزە. ئێمە چەند کەسمان هەیە لە فرانسی ئەم سەرچاوانە بکەنە کوردی، بە داخەوە زۆر کەم. ئەمەش هۆیەکەی دیارە. پاشان دیاردەیەکی تریش هەیە، سەرچاوەی زۆر لە چەقبەستن دۆگماکان کێشەی ئیدیۆلۆژییە، لە ناو ئێمە ناکۆکی ئیدیۆلۆژی زۆرە، هەمانە لە ڕوانگەیەکی چەپ "سەرەڕای ئەمانی" وەك مۆدێلك ئەدەب دەخوێنێتەوە، هەمانە لە ڕوانگەیەکی ڕوحی وشك و ڕەق و تەق ئەدەب دەخوێنێتەوە، هەمانە موریدی ڕۆژئاوایە بێ تێگەیشتن لە ڕۆژئاوا لەم ڕوانگەیەوە ئەدەب دەخوێنێتەوە، زیاتر وەك لاف لێدانێك، هەمانە لە ڕوانگەی حزبەکەی خۆی ئەدەب دەخوێنێتەوە، ئەمدی یەکێك وەك مرۆڤێکی سادە و ساکاری کوردی لە ڕوانگەیەکی تازە و نوێوەی مرۆڤی هاوچەرخی کوردی و خەمەکانی ئەدەب بخوێنێتەوە و ئەدەب بەرهەم بهێنێ.

**پ/ میتۆدی بونیادگەری چییە؟ ئەم میتۆدە گرنگی بەچ لایەنێکی تێکست دەدات؟ ئەم میتۆدە تاچەند دەتوانێت ڕەخنەی ئەدەبی کوردی فراوانو دەوڵەمەند بکات؟**

وەلاّم : ستروکتورالیزم زۆر پێناسەی هەیە، ئەمەش بە پێی ئەو بوارانە دەگۆڕێ کە کاری لەسەر کراوە، وەك زانستی زمان و ڕەخنە و ئەنترپۆلۆژی و فەلسەفە ...هتد. بۆ نموْنە ستروکتورالیزم لە لای ڕۆمان ژاکۆبسن Roman Jacobsonجیایە وەك لە لای فێردیناند دو سۆسۆر F. De Sausseure، هی ئەمە جیایە لە کلۆد لیڤی ستڕۆسC. L. Strausse، ئەمەی دوایی

جیایە لە هی رۆلان بارت، ....هتد، سەرەنجام ئەم هەویرە ناوێکی زۆری دەوێ، بەلاّم لێرەوە من تەنیا دەگەڕێمەوە پێناسەی رۆلان بارت، چونکە ئێمە باس لە ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی دەکەین. ستروکتورالیزمی بارت لەسەر بنچینەی خوێندنەوەیەکی نوێ دامەزراوە بۆ ئەدەب، بێگومان ئەو سوودی لە هەموو ئەوانەی پێش خۆی وەرگرتووە، ئەگەرچی هەر خۆی بە مێتۆدێکی کۆنی لە قەڵەم دەدا، بە هی سەردەمی زمانەوانەکانی لەقەڵەم دەدا، واتە سالاّنی بیستەکان و سییەکان، وەك فێردیناند دو سۆسور و هی تر، بە گشتی بنچینەی ڕوانینی ستروکتورالیزمی بارت لەسەر هەندێ پرسیاری سادە بەندە، وەك : مردنی نووسەر، لە دایکبوونی خوێنەر، نووسەر کێیە، ئایا کە ڕۆمانێك دەخوێنینەوە ئێمە فکر و خەیاڵی نووسەرەکە دەخوێنینەوە یان ڕۆمانێك دەخوێنینەوە خوێنەر پەیوەندی لەگەڵ زمان و شێوازە. کێشەی زمان یان شێواز Langage ، ئینجا زمان یان شێواز چییە ؟ هەموو نووسینێك بە ڕای ئەو لە دوو بوار پێکهاتووە، Signifiant et Signifie کە وەك یارییەکی زمانەوانی دێتە بەرچاو، واتە : وێنە و مەبەست یان مانا دەگرێتەوە (دال و مدلول) ئەمەش ڕەگەکەی لە سەرچاوەکانی زمانناسەکانەوە دێ لە ژاکۆبسنەوە بگرە تا دەگاتە "بازنەی پراگ" و سیمیۆتیکە نوێیەکان وەك ئەمبێرتۆ ئێکۆ. لە لای بارت : لەو چرکەی ئێمە دەخوێنینەوە نووسەر دەمرێ و خوێنەر لە دایك دەبێ، نووسەریش تەنیا بەو تێکستانە بە نووسەر حسێب دەکرێ کە کارێکتەری "تێکستی" هەیە، بۆ نموونە کە بایۆگرافی نووسەرێك دەخوێنینەوە ڕاستەوخۆ دەزانین، خوێنەر دەزانێ ئەم بایۆگرافییە زانیاری لەسەر ئەم نووسەرە هەیە، بۆیە ئەم لایەنە بە دیاردەیەکی لاواز دادەنرێ بۆ فکر و خەیاڵی نووسەر،چونکە نووسەر بە تێکستەکانی دەناسرێتەوە نەك بە زانیارییەکانی. بەلاّم کە (تێکستێك) وەك شیعر، ڕۆمان، گوتار ....هتد دەخوێنینەوە، ئەوە فیکر و خەیاڵی نووسەر نییە ئێمە دەخوێنینەوە بەڵکو ئەمە جیهانێکە بە زمان تەعبیری لێکراوە، بەرهەمێکی زمانەوانییە، چونکە خوێنەر بە ئارەزووی خۆی دەتوانێ کاری تری لە ناو بکا، بۆ نموونە دەڵێ هەر بەرهەمێك کە بلاّودەبێتەوە لێکدانەوەی لە لایەن

نووسەر هیچ نرخێکی نیە، نووسەر بە نووسینەکانی دروست دەبێ نەك بە پێچەوانەوە، نووسەر لە بنچینەی تێکستەکانیدا نیە، بەڵکو ئەوە زمانە کە ئەم بنچینەیە پێکدەهێنێ.

**پ/ میتۆدی بوونیادگەری (ستروکتورالیزم) لەناو ڕەخنەی ئەدەبی کوردی، وەك میتۆدە نوێکانی دی، زۆر کەم کاری پێکراوە، بۆ خوێندنەوەی تێکست، پێتوایە خەوشیەك لەم میتۆدەدا هەبێت،( بەوەی لایەنی کۆمەڵایەتیو لایەندەرەکیەکان فەرامۆش دەکات)؟ پێتوایە ئەمە خەوشیە؟ یان ڕەخنەگرانی ئێمە توانای زاڵبونیان بەسەر ئەم میتۆدەدا نیە بۆ سودی لێوەرناگرن؟**

وەڵام : هەموو کێشەکان دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتن و باش سوود وەرنەگرتن لە سەرچاوە جیهانییەکان و ئەزموونە نوێیەکان بە شێوەیەکی پوخت و دروست، چەند کتێبی رۆلان بارت لە فرانسییەوە کراوەتە کوردی، کتێبەکانی ژاکۆبسن، هی لیڤی سترۆس، هی بازنەی پراگ و زمانناسە نوێیەکان ...هتد، هیچ ! بە تایبەتیش لە زمانی خۆیان، واتە فرەنسی و ئەڵمانی و ...هتد. لەو باوەڕەم ئەم لایەنە گرفتەکە پیشان دەدا. بۆیە ئەوەی تا ئێستا نووسراوە و گوتراوە زۆر لاواز و سادەیە.

**پ/ پێتوایە ڕەخنەی ئەدەبی گوردی تاچەند لە ئێستادا لەوە بەئاگابووەتەوە، کەواز لە پەسنو پیاهەڵدان بێنێت، یان واز لەدیدی نووسەر بهێنێت، هەوڵبدات ڕۆبچێتە ناو تێکستەوەو تێکست بپشکنێیت؟**

وەڵام : هەر ڕەخنەیەك لە ڕوانگەیەکی بێ لایەنەوە نەنووسرێ مەرگی خۆی هەڵگرتووە. پەسن و پیاهەڵدان ناچێتە چوارچێوەی ڕەخنە، هەتا گوتارێکی ڕەخنەیی سادە و ساکاریش. ئەمەش لەو باوەڕەم لە لای ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی خوێندنەوەی تیۆری و پراتیکی، لێکۆڵینەوەی تیۆری و پراتیکی لە ناو ئەدەبی ئێمە، بە گشتی لە ناو ڕۆشنبیری ئێمە زۆر لاوازە. ئەمەش پێمان دەڵێ هێشتا لە ناو ئێمە فۆرمی بیرکردنەوەی کۆمەڵگەی کشتوکاڵی و نەریتپارێز و

میللیانه باوی هەیە، سەرەنجام ئەمەش بە شێوەیەکی زۆر ڕاستەوخۆ لە نووسین و بەرهەم هێنانەکان ڕەنگ دەداتەوە.

**پ/ ئەو گرفت و کێشانە چین کە ڕەخنەگر لەلێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا ڕووبەڕوی دەبێتەوە؟ دەتوانین ئەو گرفتانە بە هۆکاری لاوازی ڕەخنەی ئەدەبی بزانین؟**

وەڵام : یەکەم شارەزا نەبوون لە میتۆدە جیاوازەکانی لێکۆڵینەوە، نەزانینی زمانی زیندو و جیهانی بۆ سوود وەرگرتن لە ئەزموونی دەوڵەمەندی جیهانی. بێگومان هێشتا هۆکار زۆرن.

**پ/ پێتوایە وەرگێڕانی ئەو کتێبانەی کە تایبەتن بە میتۆدە نوێکانەوە تاچەند گرینگن، بەو پێیەی ئێستا زۆرترین خوێنەری کورد تەنیا بە زمانی کوردی دەخوێنێتەوە؟**

وەڵام : ڕاستییەکەی وەرگێڕان یەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانە بۆ ئاشنا بوون بە ئەویتر _L'autre، ئەویتری شارستانی، ئەویتری بیرکردنەوە و شێوازی جیاواز. ناسینی ئەویتری جیاواز لە من کە ڕێگای ئەوەم پێدەدا باشتر خۆم بناسم، لە سەر ئاستی میللەتانیش ڕێگامان پێدەدا باشتر خۆمان بناسین. وەرگێڕان هۆکاری سەرەکی دەوڵەمەند بوون و ئاشنا بوونە بە فۆڕمەکانی نووسین و بیرکردنەوە و فۆڕمە کولتوورییە جیاوازەکان، وەرگێڕان پێمان دەڵێ هیچ ئەدەبێك سنوورێکی دیاری کراوی نیە، سنووری ئەدەبی و ڕۆشنبیری هەر نەتەوەیەك لە ناو یەکێکی تره. بێجگە لەمە، وەرگێڕان دەبێ ئەوەندە پوخت و جوان بێ، بخرێتە ناو فۆرمی زمانی و کولتووری و کەسایەتی هەر زمان و کولتووری نەتەوەیەك. بە داخەوە لە ناو ئێمە وەرگێڕانی پوختە زۆر کەمە.

دیمانە : هەرێم

# له بارەی وەرگێڕان
## گفتوگۆ لەگەڵ د. موحسین ئەحمەد عومەر

**پ/ وەرگێڕان وەك بنەمایەكی (كلتوورسازی)، چەندە كاریگەرە لە دروستكردنی پاشخانێكی هزری و بنیاتنانی كلتوور بە گشتی؟**

وەلام: هەڵبەت كاریگەرییەكی زۆری هەیە، هەموو كولتوورێك، یان باشترە بلێین هەموو رۆشنبیرییەك ( بۆ ئەم حاڵەتە من رۆشنبیریم پێ باشترە وەك لە كولتوور، چونكە ئەمەی دواییان فراوانترە و كێشەی ئاڵۆزتر دروست دەكا) هی هەر نەتەوەیەك بێ، لە رێگای وەرگێران ئاشنای رۆشنبیریی دیكە دەبێ و خۆی پێ نوێ دەكاتەوە. لە رۆشنبیری لێ وەرگێڕدراوەوە، ئاشنای هزرو روانینی دیكە دەبین و سەرەنجام ئەمەیان وەك خۆ باشتر ناسین لێكدەرێتەوە، خۆباشتر ناسینیش كێشەیەكی فەلسەفی و دەروونی و كۆمەلایەتیە، دەمێكە، لەسەردەمی سوكراتەوە ئەم دیاردەیە بۆتە كێشەیەك و مرۆڤ بە دوای ویلە. وەرگێران كولتوورێك بۆ ناو یەكێكی دیكە دەگوازیتەوە و هەر ئەم گوازتنەوەیەشە دەبێتە پاشخانێك بۆ كولتووری بۆ وەرگێڕدراو و دروستكردنی پاشخانی هزری تر. وەرگێران باشترین ر گونجاوترین رێگایە بۆ بە یەك گەیاندنی مرۆڤە جیاوازەكان و كولتوورە لێك دوورەكان.

**پ/ وەرگێڕان و زانینی دوو زمان بە ئەبستراكتی، چەندە توانای ئاشنابوون و گواستنەوەی كلتوور و مێژووی ولاتانی دیكەی هەیە بۆ نێو كەلتووری (بۆ وەرگێڕدراو)؟**

وەڵام: کە دەڵێی زانینی دوو زمان بە ئەبستراکتی نازانم دەتەوێ بڵێی چی؟ من لەم ڕستەیە ناگەم. هەر چۆنێك بێ من لەو کەسانەم کە باوەڕیان وایە هەر تەنیا زانینی دوو زمان بە قووڵی تێری ئەوە ناکا تێکستێك وەکو خۆی بهێنیتە ناو زمانی بۆ وەرگێڕدراو. ئەو کەسەی لە زمانێکەوە وەردەگێڕێ دەبێ شارەزایی لە کولتووری ئەو زمانە هەبێ، ئاگای لە مێژوو و داب و نەریت و کەسایەتی دەروونی و کۆمەڵایەتی و جوگرافیا و سیاسەت و ... هەموو شتێکی ئەو کولتووری لێ وەرگێڕدراو هەبێ. بۆ نموونە من شانۆگەری (دەستە پیسەکانی) ژان پۆل سارترم لە فرانسیەوە بۆ کوردی وەرگێڕا ساڵی ٢٠٠٢ لە لایەن ئاراس چاپ کراو بلاۆکرایەوە. ئەم وەرگێڕانە کاری زۆری تێدا کراوە جوان وەرگێڕدراوە، دواتر بینیم ساڵی پار برادەرێك تەکلیفێکی خۆرایی داوەتە خۆی لە عەرەبیەوە هەمان شانۆگەری کردۆتە کوردی، بەڵام لە چاو وەرگێڕانەکەی من هەتا بڵێی سەقەتە. هەمان شت ڕاستە بەرامبەر بە ڕۆمانی (بێگانە)ی ئەلبێر کامو، من لە فرەنسیەوە کردومەتە کوردی و ساڵی ١٩٩٨ لە هەولێر چاپکراوە، بەڵام دواتر برادەریکی تر هەمان ڕۆمانی لە فارسی کردووە بە کوردی بە ناوی (نامۆ) بلاۆی کردۆتەوە، ئەگەر وەرگێڕانی من و هی ئەو برادەرە بەراورد بکەی ئەرز و ئاسمانیان فەرقە. یەکێك کە بیەوێ شتی ئەلبێر کامو بکاتە کوردی دەبێ لە فەلسەفە و شێوازی نووسینی ئەلبێر کامو شارەزا بێ. ئیتر ئەم شارەزاییە لە وەرگێرانەکانی من دیارن و هەستیان پێ دەکرێ، بەڵام لە وەرگێڕانەکانی تر هەستی پێ ناکرێ

**پ/ نووسین لێپرسراویەتییە و لە بەرامبەریشدا وەرگێڕان لێپرسراویەتییەکی لەو گەورەتر. ئایا دەکرێت بڵێین بەو فەرهەنگە (قامووس) لاواز و ئەزموونە کەم و کورتەی کە لە کتێبخانەی کوردی ئامادەگی هەیە، وەرگێڕانێکی جدی لە هزر و فەلسەفە دروست بێت؟**

وەڵام: ئەمەیان پەیوەندی بە لاوازی و کەم ئـەزموونی فەرهـەنگ و کتێبخانـەی کوردییەوە نیە، بەڵکو پەیوندی بە وەرگێڕ خۆیەوە هەیە، ئەگەر وەرگێڕ لاواز بـێ بەرهەمەکەشی وەکو خـۆی لاواز دەبـێ. بۆیـە شـارەزایی و لێ زانـی و دوایـش دڵسۆزی و راستەوخۆ لە زمـانی یەکەمـەوە وەرگێـڕان، وەرگێڕانـی پوختـەی لێ دەکەوێتەوە. بێگومان وەرگێران بەرپرسیاریەکی مێژووییە، ئەوەی بەرامبەر بـەم دیاردەیە هوشیار نەبێ وەرگێرانی نایابی نابێ.

**پ/ وەرگێڕانێکی باش خۆی یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی وەرگێڕان، ئایا بەڕای جەنابتان هەڵبژاردنی دەقێکی ناوازە خـۆی بەشـێك نییـە لـەو تایبەتمەنـدی و پرۆسەیەی کە پێی دەڵێین وەگێڕان؟**

وەڵام: دیسان پرسیارەکەت زۆر ڕوون نیە، تا ئەو ئاستەی لێی تێ گەیشتبم، مـن بۆ خۆم کاری وەرگێران بەردەوام دەکەم، بەڵام شتێك ناکـەم خـۆم ئـارەزووم لێـی نەبێ، بە کورتی من شتێك، ڕۆمانێـك، لێکۆڵینەوەیـەك ، تێکـستێك دەکەمـە کوردی کە لەگەڵ فەلسـەفە و ڕوانینی خۆم بگونجێ و جیهـانی ئـەو تێکـستە لـە جیهانبینیی من نزیك بێ. من حەز لە ئەلبێر کامو و سارتر و پاسترناك و ئـارتور کۆسلەر و ئۆکتاڤیۆ پاز و سان ژۆن پێرس ...هتد دەکەم، بێگومـان هـی تـریش هەن، من کاری ئەمانە بە چەشە و تامێکی زۆرەوە دەکەمە کـوردی، بێگومـان نووسەری تر زۆرن بەڵام من تەنیا بە لای ئەمانەدا دەچم.

**پ/ ئایا لە وەگێڕاندا کێشەیەکمان بۆ دروست نابێت لە تەرجەمەکردنی هزر، بە حوکمی ئەوەی کە لە فەرهەنگی هزریدا هەژاری وشە و دەستەواژە باڵادەستە؟**

وەڵام: هزر چیە هزر؟ هزر لە پرۆسەی وەرگێڕان بریتیە لـە زمـان لـە حاڵـەتێکی خاو، خۆ هزر بریتی نیە لە قاڵبێکی زمانەوانی داڕێژراو لە ناو مێـشک. هـەمو هزرێك لە پرۆسەی نووسین لە حاڵەتی وێنەییە، کە دەکەوێتە سەر کاغەز شـێوەی

گرافیکێك وەردەگرێ لە چواچێوەیەکی زمانی دارێژراوەتەوە، ئەمەیان دەکەوێتە سەر شارەزایی و لێزانی وەرگێڕ خۆی، وەرگێڕی زمان زان و شارەزا دەتوانێ بەرگێکی جوان دروست بکا، بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە.

**پ / یەکێك لە ئاراستە بەهێزەکانی مۆدێرنە، دروستکردنی پردی پەیوەندی و دیالۆگی شارستانیەت و لەویش گشتگیرتر دیالۆگ و پێکهەڵپرژانی کلتوورەکانە. تەرجەمەش چ پشکێکی لەم نێوەدا بەردەکەوێت؟**

وەلام: ڕەنگە لە سەر هەڵە نەبم ئەگەر بڵێم بەجیهانیبوون سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ وەرگێران، لێرەوە مەبەستم ئەوە نیە باسی بەجیهانیبوون بکەم، بەڵکو ئەمەیان ڕەنگە وەلامێکی زۆر گونجاوی پرسیارەکەی ئێوە بێ، وەرگێران یەکەمین پەیوەندی راستەوخۆیە لە نێوان کولتوور و جیهانەکان، ڕاستە وەرگێران لە نێوان کولتوور و جیهانەکان لەگەڵ سەردەمی نوێخوازی، واتە لەگەڵ سەردەمی بە ماددی بوون و بە پیشەسازی بوونی کۆمەڵانی خەڵکەوە زیاتر گەشەی کردووە. وەرگێڕان جیاوازی و خاسیەتە تایبەتیەکانی کولتووره جیاجیاکان لە ناو دەبا و کولتوورەکان لێك نزیك دەکاتەوە. دواجار مرۆڤەکان بەیەك دەگەیەنێ و ئاشنایەکی جیهانی دروست دەکا.

دیمانە : ئاودێر

# شیعر یان ڤروم ڤروم

**نووسینی : ژاك رووبۆ***

**دڵنیابوون**

سەدەی بیست و یەکەم دواجار باش خۆی دامەزراند و شیعریش بەردەوامە لە پاشەکشەکردن لە ڕۆژنامەکان : "پاشکۆی لۆمۆندی کتێب" جاری وا هەیە ساڵێك تێدەپەڕێ بێ ئەوەی شتێك لە بارەی کتێبێکی نوێی شیعری هاوچەرخی فرانسی بڵێت، کتێب فرۆشیەکانیش، زۆربەیان ئەمڕۆ ڕەفەیەك چیە بۆ کتێبی شیعریان تەرخان نەکردووە، تەلەڤیزیۆن هەر مەپرسە (خۆ پێشتریش لە سەدەی ڕابردوو هەر وابوو) کەیفی بە شیعر نایێ. جۆرێك لە هەراسانی بەردەوام تا ئەمڕۆ ڕێگر بووە لە دەستەلاتی کولتووری گرینگی بە ئەنجامەکانی کێشەیەکی لەم جۆرەی کۆمەڵگا بدا. بەلاّم سەرەنجام هەروایە و مەسەلەکەیان پشت گوێ خستووە بێ ئەوەی سەرەنجی بدەنێ.

دوو نموونە : لە دوا پێشانگای گەورەی کتێبی پاریس مەکسیك داوەت کرابوو، ڕیزێك نووسەر داوەت کرابوون. شاعیرێکیان تێدا نەبوو. هەتا لە ناو نێردەی فرانسا بۆ ولاتە یەکگرتووەکان کە لە بەهاری ئەمساڵ چوو بوون، شاعیرێکی فرانسییان تێدا نەبوو نوێنەرایەتی ئەدەبی نوێی فرانسی ئەمڕۆ بکات. تێبینی ئەوەش دەکەین کە ئەندامانی ژووری(ناوبژی) خەلاّتی نۆبل ساڵی ٢٠٠٨ بڕیاریان دا ئەم خەلاّتە بدەنە نووسەرێکی فرانسی، کەچی دایانە ڕۆمانووسێك (١) (ڕاستە

کارێکه جێگای ڕێز و ستایشه) بەڵام گونجاو نیه گەورەترین شاعیری فرانسی کـه هێشتا له ژیاندا ماوه پشتگوێ بخرێ، مەبەستم "ئـیڤ بۆنفـوا" یـه. ئـەم بـاره دەگەڕێتەوه بۆ ئەوه گوایه شیعر ئابووری خـۆی نیـه، شـیعر نافرۆشـرێ کەواتـه گرینگی نیه. ڕاسته به تەنیا هەر ئەم جۆره ئەدەبییه نیه که (بازاڕی خۆی) نیـه له ناوەندی کولتـووری هاوچـەرخ. ئـەم دیاردەیـه ڕۆمـان و ئـەدەبی بـه گـشتی گرتۆتەوه. بەڵام له بارەی شیعرەوه سەروکارمان لەگەڵ دیاردەیەکی تری بـەهێزتر هەیه لەم گرینگی پێ نەدانه به شیعر.

## خەتای کێیه ؟

نزیکەی سەدەیەکه هۆکاری سەرەکی دەگەڕێننەوه بۆ دیاردەیەکی تایبـەتی کـه پەیوەندی به شاعیرەکانەوه هەیه، لەم بارەیـەوه ڕیزێـك وشـه و ڕوانـین دەهێننـه پێشەوه بۆ پیشاندان و به ڕاست گەڕاندنی لاوازی بازرگـانی، دەڵـێن : شـاعیره هاوچەرخەکان سەختن، هەڵبژاردەن، شیعر چالاکییەکی بێهوودەیه و پەیوەندی بـه ڕابردووەوه هەیه. شاعیرەکان گـشتییان نەرجـسین، ئاگایـان لـه دنیـا نیـه چـی ڕوودەدا، بەشـداری لـه ئـازادکردنی ڕفێنـدراوەکان ناکـەن، خـەبات لـه دژی تیرۆریستان ناکەن، گۆڕانی کۆمەڵایەتی تێناگەن، هیچ ناکەن بۆ ڕزگارکردنی گۆی زەوی. زمانی هەموو خەڵك نازانن، ...هتـد. لەبـەر ئـەم هۆیانەیـه کـه شـیعر ناخوێندرێتەوه. تەنیا ئەوەیان بۆ دەمێنێتەوه شاعیرەکان له نـاو یـەکتری خۆیـان بخوێننەوه.

بێ سووده گرینگی بەم ڕیزه تاوانبارکردنانه بدەین، تـەنیا ئەمەنـده دەڵـێین : ئەوەی حەز به شیعر دەکا و هوگۆ و بۆدلێر و رامبۆ و ئێلوار و ئەراگۆن و شـار و میشۆ بۆ نموونه دەناسێ و دەخوێنێتەوه، بەڵام دەبینـێ شـاعیرەکانی سـەردەمی خۆی ناخوێنێتەوه و تێیان ناگا و لەو باوەڕەدایه ئەمانـەی سـەردەمی خـۆی بـه سەختی دەنووسن، پێموایه ئەم کەسه وەکو ئەوه وایه نەخۆشییەکی گرانی هەبێ، ناچار بێ یەك مانگ له ناو جێگا بێ، دوای به هۆش هاتنەوه دەبینێ نەدەتوانێ بڕوا نه خۆی لەسەر پێیەکانی ڕابگرێ. ئەمه حاڵەتی ئەو خوێنەرەیـه کـه چـیتر

شیعر ناخوێنێتەوە : هەرچەند کەمتر بخوێنینەوە، کەمتر دەخوێنینەوە، سەرەنجام کە بە ڕێکەوت دەخوێنینەوە ئەو کاتە هەست دەکەین تێناگەین.

شیعری جیهانیی ئازاد (ش ج ئا)

ئەم دیاردەیەی سەرەوە هەڵبەت بێ کاریگەر نەبووە لە سەر شاعیرەکان خۆیان. ئەمەش بە زۆر شێوە کە من نامەوێت لە نرخی هیچ یەکێکیان کەم بکەمەوە. یەکەم نیشانەی (ڕوخانی شیعر) بریتی بوو لە گەشەسەندنێکی فۆرمی، ئەمەش مێژوویێکی دوور و درێژی هەیە. سەرەتا شیعری ئازادی ستانداردی سوریالی جێگای شیعری کێش و سەرواداری تەقلیدی گرتەوە. رووخانەکەی بۆ جارێکی تر بە هۆی ئەڤانگاردەکانی ساڵانی ١٩٦٠ بوو (دونیس ڕۆش) و هەڵگێڕانەوەی بۆ شیعری جیهانیی ئازاد (ش ج ئا) وەك هەموو کەرستەیەکی تر لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمرکا هێنرا، شیعری جیهانی ئازاد شیعرە. نە کێشدارە نە سەروادار، بێجگە لەمەش سەر بە هیچ نەریتێکی شیعری زمانێکی دیاریکراو نیە، ئەم جۆرە شیعرە (کە گەڕانەوەی زۆری تێدایە بۆ سەری دێڕ) بەو مەبەستەیە پچرانێکی بە هێزی سینتاکسی تێ نەکەوێ. دەتوانین شیعری جیهانیی ئازاد تا ڕادەیەك بە هەموو زمانەکان بنووسین. چ سوودێکی هەیە ؟ زۆر بە ئاسانی دەتوانین لە سەختی گومرگی (مافی وەرگێران) تێپەڕین کە وەشانخانەکان و وەرگێڕەکان سارد دەکاتەوە، بەم جۆرەش لە مانەوە لە ناو (سنوری زمان) دەردەچین کە بۆتە شتێکی ترسناك لەم سەردەمەی بە جیهانیبوون.

شیعری جیهانیی ئازاد ئەمڕۆش ئامادەیی لەسەر شانۆی شیعری جیهانیی هەیە، لە هەموو فێستیڤاڵێك ئەنتۆلۆژی شیعر و گۆڤاری شیعری دەست دەکەوێ. داواکارییەکان لە مەڕ فۆرمی شیعری بە شێوەیەکی دیار لاوازن. ئەم کێشەیەش کێشەیەکی تر ڕادەکێشێ کە بریتییە لە خزینێکی هەستیارتر بەرەو هەنگاوێکی (ترۆپکی هەنگاو) گەشەسەندنی فۆرمی: ئەمەش ئەو بیردیە کە شیعر چیتر پێویست نیە. پێشتر ئەو تەندانسە هەبوو، لە ساڵانی نۆوەدەکانی سەدەی رابردوو، خۆشم زۆر جار هەستم بەم بزربوونە کردووە، لە کاتی خوێندنەوە، لە ڕێنووسی زۆربەی شاعیرەکان، کە شیعرەکانیان وەك پەخشان

دەخوێننەوە، پەخشانێك ڕازاوە بێ بە ڕەوانبێژییەكی دەنگی، لەبەر ئەوەی دەبێ ئەو شتە پیشان بدرێ كە ئەمە شیعرە. لەم حاڵەتەدا، باشتر نیە زۆر بە سادەیی پەخشان بهۆنینەوە ؟ شیعر، شتێكی هەستیارە بە تایبەتی لە لای شاعیرانی خاوەن مێژوویێك لە فرانسا و لە ولاّتە یەكگرتووەكان، لە شێوەی پارچە پەخشانی كورت دەیهۆننەوە، بەلاّم بە شێوەیەكی دیار گێڕانەوەی تێدانیە. نەبوونی هێڵێكی گێڕانەوە تاقە نیشانەی مەرجی بە شیعربوونە.

## هێشتا دەتوانین بە خۆمان بڵێین شاعیر ؟

باشە بۆچی لە ناو ئەم مەرج و هەڵكەوتە درێژە بەو ڕوانینە بدەین و خۆمان بە بەشێك لە گروپی شاعیران بزانین ؟ وەلاّمی ئەمە زۆرجار ناكۆك و تەمومژاوییە. لاوازی شیعر لە بواری ئابووری كێشەی تر ڕادەكێشێ، وابزانم ئەمەیە ئەنجامی سروشتی جۆرە كۆمەڵگایەك كە تێیدا شاعیرێك، وەك هەموو ئەوانی تر دەژی و كۆمەڵگا جۆرە ڕقێكی تا ڕادەیەك دیارو شاراوە بەرامبەر هەموو ئەوانە پیشان دەدا كە ئەم ناوە هەڵدەگرن. شیعر خۆی زۆر لەو ڕووداوانە نزیك ناكاتەوە كە لە هەموو لایەك ڕوودەدەن (بەلاّم ئەمە ڕۆلی شیعر نیە بۆ من). بەلاّم ئەگەر بە ڕێكەوت ئەوها بێ و شیعر خۆی لە ڕووداوەكان نزیك بكاتەوە، بەو جۆرە وەلاّمی دەدەنەوە، وەك ئەوەی ستالین وەلاّمی كەسێكی دابێتەوە باسی نەیاری پاپای بۆ سیاسەتی ئەو كردبێ : (ڤاتیكان ؟ چەند فرقەیە ؟) بۆ جیهان و بۆ (لاپەرەی چوارەمی ڕۆژنامەكان) شاعیربوون لە بنچینەدا زۆر بە وردی هیچ مانایەك ناگەیەنێ.

لە لایەكی تر، دەڵێن شیعر شتێكی بەگزادانەیە Noble، ئەو شتە نیە كە شاعیران دەیكەن. شایانی ئەمە نین. شیعر لە لایەكی ترە : لە ناو گۆرانییە، لە ئاوابوونی خۆرە، لە ناو ڕۆمانە،...هتد. چونكە شیعر بۆ جیهان، چیتر قووت نادرێ ئەگەر لەو شوێنەی دەبێ بیدۆزینەوە ئەو لێی نەبێ. ئەمەیە كە دەتوانین ناوی بنێین هەڵبەت بە سوود وەرگرتن لە دەستەواژەیەكی یانیك لیرۆن (كاریگەری- فانتۆم). شیعر مرد بۆ هەموو ئامانجێكی پراتیك، بەلاّم كاریگەری

دەمێنێتەوە. دەتوانێ ( لە ژێر هەر فۆرمێك بێ، بەلاَم کەمتر شیمانەی ناسینەوەی هەبێ لە ناو شیعری شاعیران) سوودی هەبێ، بۆ نموونە بۆ (کولتووری کۆمپانیاکان).

شتێکی سەرسوڕهێنەر نیە بۆ زۆر کەس ئەمڕۆ بڵێ شاعیرم هەست بە جۆرێك لە بێ مانایی نەکا، بگرە هەست بە شەرم نەکا. ئەنجامەکانی ئەو شێبوونەوە فۆرمییەی لە سەرەوە باسمان کرد، لەگەڵ هەستی نەگونجان لەگەڵ جیهان تێکدەکەنەوە. ئارەزوویێکی دروستی ناساندنی کۆمەلاَیەتی پیشان دەدەن، بۆ بردنی ژمارەیەکی زۆری شاعیران بەرەو ئەوەی شیعرەکانی خۆیان وەك شیعر پێشکەش نەکەن و نەناسێنن، خۆشیان ئەوە ڕەت بکەنەوە شاعیر بن، ئەمەش ڕێگا لەوە ناگرێ وەشانخانەکان یان شاعیرەکان خۆیان داوای یارمەتی دارایی بکەن لە (سەنتەری نیشتمانی کتێب) داوا لە کۆمیسیۆنی (شیعر) بکەن یارمەتیان بدا بۆ بلاَوکردنەوەی بەرهەمەکانیان.

پاشان دەبینین نایابترین شاعیر بە هۆی نەبوونی هیچ سەدایەکی بەرهەمەکانی سارد دەبێتەوە(چونکە نافرۆشرێ، ساڵێك، دوو ساڵ چاوەڕێ دەکەن سەرەنجام شیعرەکانیان لە وەشانخانەیەکی بچووك دادەبەزێ یان لەسەر ئەرکی خۆیان چاپی دەکەن، پاشان بێدەنگی میدیاشی دێتەسەرێ) بۆیە شاعیرەکان دواجار ڕوو دەکەنە بوارێکی تر : ڕۆمان، شانۆ، سینەما یانیش ئۆپێرا.

## بەرهەمەکانی گۆڕینەوە :

لەبەر ئەوەی شیعر لەسەر ئاستێکی جیهانی سوودی نیە، واتە نافرۆشرێ، ڕابردووە، لێی ڕەتبووینە، چالاکییەکی زمانەوانییە و مۆدێلی نەماوە، جۆرێکی ئەدەبی ناشرینە، زۆر لە ڕووناکبیران گەیشتوونەتە ئەو ڕوانینەی خراپ نیە ئەگەر لە ناوبچێ. شوێنەکەشی بە هاوتایەکی نوێ پڕ بکرێتەوە، ئەم شتە نوێیەش خۆی لە ڕابردووی ئەدەبی ئازاد کردبێ، شتێك (بە ڕەهایی نوێ) بێ جێگای بگرێتەوە. ئەمەش ئەو شتەیە کە پێشتر ئەوانەی خۆیان بە خۆیان دەگوت ئەڤانگارد بە کاریان دەهێنا کە پێیان دەگوت (تێکست) لە جێگای شیعر ناویان دەهێنا.

(تێکست) بزر بوو، بە ڕواڵەت هیچ پاشماوەیەکی لە دوای خۆی بە جێ نەهێشت، بەڵام توانیمان تێبینی ئەوە بکەین زیندووبوونەوەیەکی تازە دەرکەوتووە لە ژێر ناوی (دۆکیومەنتی شیعری).

دۆکیومەنت، کە نیمچەوشەیەکی پێناسەکەرە، فۆرمێکی نوێی (تێکست)ە، داوای ستاتویەکی شێلگیر دەکا، بە ڕواڵەت کەمتر میتافیزیکە وەك لەوەی پێش خۆی، تا ڕادەیەك زانستییە. بەڵام، کەمتر رادیکالە لە چاو باب و باپیرانی سالآنی شەستەکانیان( لێرە نووسەر مەبەستی ستروکتورالیستەکانە، وەرگێڕ)، دامەزرێنەرانی ئەم جۆرە ئەدەبییە نوێیە لە ناوەڵناوی (شیعری) یان دابڕاند. هەوڵیاندا بەڕاستکەڕاندنی ئەم بەکارهێنانەی ئەم ناوەڵناوە کە بۆ هەموو خەڵك مانای شیعر دەگەیەنێ، وەك ئەوەی باوە لە هەموو زمانە ئۆروپییەکان ماوەی چەندان سەدەیە، هەڵبەت بە هۆی لێکدانەوە ئیتیمۆلۆژییەکەی. ژان پوهان، لە کتێبێکی بچکۆلە بە ناوی (بە لگە بە پێی ئیتیمۆلۆژی)(٢)، ئەوەی پیشاندا کە پێشان ئەم لێکدانەوەیە خەسڵەتێکی بێ مانای هەبووە (کە هەندێ فەیلەسوف زیادەڕۆییان تێدا کردووە)، ئەم لێکدانەوەیەش بە گریمانەیەك پشت ئەستوورە کە قەت ڕێی تێ ناچێ، کە مانای زاراوەیەك بە درێژایی چەندان سەدە هاوتەریب گەشە دەکا لەگەڵ ئەو جەوهەرە زمانەوانییەی کە لە بنچینەدا لێی دروست بووە یان پێکیهێناوە. سەرەنجام لە حاڵەتی (دۆکیمەنتی شیعری) ناوەڵناوەکە بە پێی ئیتیمۆلۆژی لێکدراوەتەوە، بەو مەبەستەی (دۆکیمەنت) سوود لە (کاریگەری — فانتۆم) وەرگرێ کە وشەی (شیعر) هەیەتی.

## شیعر وەك پێویستی

بە پێی ئەوەی تا ئێستا گوتراوە پێدەچێ تەمەنی شیعر کورت بێ. لەگەڵ ئەمەش، لە ناو کۆمەڵانی خەڵك، ئەوانەی چیتر خوێنەری شیعر نین، یان بەلای کەمی خوێنەری شیعر نین، یان زۆر بە سادەیی خۆیان بە خوێنەر دادەنێن، کە ئەمەشیان کەم بۆتەوە، سەرەڕای ئەمەش شیعر هێشتا باق و بریقێکی تێداوە ماوە. دەتوانین بە چەشنێك بدوێین، ناونیشانی کتێبێکی پۆل فوورنێل

(پایسکلێکم دەوێ)(٣)، بکەینە (شیعرم دەوێ). پێشکەوتنی تەکنیکی ڕێگـای بۆ کەم کردنەوەی خەرجی بڵاوکردنەوە خۆش کردووە، بە تایبـەتی گەشەسـەندنی بەرچـاو و بـێ نموونـەی ئەنتـەرنێت و زۆری ماڵپـەڕەکان پیـشاندانی ئـەم پێداویستییەی ئاسان کردووە. سروشتی شیعر خۆی کە پرۆسەیەکە لە ناو قەسیدە دروست دەبێ، کە ڕەهەندێکی سادەی هەیە، ئەو هەلکەوتەی دەداتێ ئاسانتر وەك لە ڕومان بخرێتە سەر شاشەی سپی، (بۆ نموونـە کـێ ڕۆمـانی "گـەڕان بـە دوای زەمەنی لەدەستچوو"ی پروستی لە سەر شاشەی کۆمپیوتەر خوێندۆتەوە ؟) هیچ بڕیارێکی پێشوەختەم لە بارەی ئایندەی e-book نیە، کە چەندان ساڵە لـەم بارەیە قەولّمان پێ دەدەن، بەلاّم هێشتا بوونێکی زۆر دلّنیاکەرەوەی نیە. "بازاڕ" ئەو کەسایەتییە سوپەرمانە کە بەسەر جیهان ڕادەگا، گۆڕەپانی بۆ خۆش دەکـا، ئەمەش بە چۆل کردنی کتێبخانە گشتییەکان لە کتێب و (کە ڕۆژ بـە ڕۆژ زیـاتر لەسـەر ئەنتـەرنێت دەفرۆشـرێت)، بـەلاّم دەبـێ ئـەوەش لـە بـیر نەکـەین کـە قەسیدەیەکی زۆر لە سەر ئەنتـەرنێت هەیـە، بـەو هۆیـەوە شـیعر زۆرتـر خـۆی دەگەیەنێتە خوێنەر وەك لە کتێب.

بە هەمان ئاراستە، خوێنەرانی شیعر، بە یەکگەیـشتنە تایبەتییـەکان زۆرتـر بوونە، ئەوانەش کە گوێیـان لێ دەگـرن زۆرتـر دێنـە بەرچـاو. جـارێکی تـریش ئابووری، ڕۆلی خۆی لەم بارەیەوە دەگێڕێ : زۆر لە شارەوانییەکان هەسـتیان پـێ کردووە کە بۆ ئەوان هەرزانترە و خەرجی کەمتر تێدەچێ یـەك دوو شـاعیر داوەت بکەن وەك لە داوەت کردنی گۆرانی بێژێك، ئۆرکێـسترایەك یـان تیپێکـی بـالێ. سەرەنجام لە ناو ئەم هەلکەوتە بوو کە (شیعر وەك پێویستییەك) شێواز و مـۆدی دەربڕینی خۆی دۆزییەوە، ئەمەش بریتییە لە : سلام. Slam .

## سلام

دەتوانین باشتر تەعبیر لە (پێویست بوون بە پایسکیل) بکـەین بـە لێخـوڕینی پایسکیلی وەرزشی ماڵەوە وەك لە سەیر کردنی "پێشبڕکێی پایسکیل سواری لە فرانسا" لە تەلەڤیزیۆن. سەرکەوتنی Velib لە پاریس بەلگـەی ئەمەیـە. بـە

هەمان شێوە پێویست بوون بە موزیك باشتر جێ بە جێ دەبێ لـە karaoke و ئامادەبوون لە کۆنسێرتەکان، بەڵام ئەمە باشتر دێتە دی ئەگەر بەشداری لـە کۆراڵێك یان لە گرۆپێکی موزیکی رۆك بکرێ. داهێنانی سلام لە سـەرەتادا بـە لای کەمی لە سەر بنچینەیەکی شاراوە و هەست پێ نەکراو هاتـەدی : هـەموو کەسێك بە شێوەیەکی گریمان نامێز شاعیرە. کەواتـە هـەموو کەسێك دەتـوانێ ببێتە (شاعیر). دەڵێن سلام (هونەرێکی دەربڕینی زارەکـی میللییـە، بـە ئـاواز دەگوترێ، لـە شـوێنە گـشتییەکان دەگـوترێ وەك بارەکـان و شـوێنەکانی تـری گردبوونەوە، ئەمەش بە فۆرمێك لە شێوەی خیتابـدانێك) ئەمـەی خـوارەوە وەك ناساندنێکی سلامە : (وشەی سلام لە زمانی سـەرجادەی ئـەمریکی هـاتووە بـە مانای (تەقە) و (کاریگەری) دێ، بە وردی لە to slam a door وەرگیراوە کە بە مانا راستەوخۆیەکەی (تەقەی لە دەرگاکەوە هێنـا) دێ. لـە چوارچێوەی شیعری زارەکی و میللی، بە مانای ئەوە دێ (پشتی ملی گوێگر بگری و بە وشە و ئیماژی (وێنە) دادەی بۆ ئەوەی بهەژێ و هوشیاربێتەوە. مانایەکی تریشی لـە لایەن "مارك سمیت" ی رابەری سەرتایی دراوەتێ، بە تایبەتی لە "گردبوونـەوەی نیشتمانی سلام" لە ئانت لە ٢٠٠٥، دەڵێ : ئەم وشەیەم هەڵبژاردووە لەبەر مانا وەرزشی و یارییەکەی : شلێم (تێنس، باسکێت، ...هتد)

چەند خاسیەتێکی سلام هەروەکو لە فرانسا پەیرەو دەکرێ بەم جۆرەیە:

- زارەکییە.

- هیچ ئامانجێکی هونەری لە پشت نیە. بە گوێرە داهێنەرانی، لەبەر خاسییەتی (دیمۆکراسی)یەکەی : سمیت ئامانجی ئەوەبوو (چەمکی چلۆنایەتی لـە نـاو شـیعر خراپ بکا (من خستوومەتە ناو کەوانە : چەند کەسایەتییەك، ئەندامانی ژووری، ناوبژیوانیکار، تێیدا تەعبیر لە چەشەی زاتی خۆیان بکەن) ئەو نموونە زۆرانەی کە دەتوانین سەیریان بکەین کە خوێندنـەوە و گـوێگرتن لەسـەر ئەنتـەرنێت، ئـەوە پیشان دەدەن کە بەرهەمی سلامیست بە گشتی هەژارییەکی بێ وێنەیە (ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ناتوانی بەم جۆرە شیعر بەرهەم بهێنێ بە مانـا ئاسـاییەکەی خۆی).

- بە گشتی سلام هونەرێکە بە ئەزبەرکردن دەگوترێتەوە. لەم ڕووەوە لەگەڵ شیعری میللی پەیوەندییان هەیە.
- بێ مانایە (جۆرێکی ئەدەبی سەدەکانی ناوەڕاست ) دابهێنرێتەوە، وەك شیعری تەنسۆن کە لە ناوچەی ئۆکسیتانی فرانسا هەبوو و لە لایەن شاعیرە گەڕۆکەکان(تروبادور) دەگوترا، کە پێشتر دوو کەس لەسەر بابەتێك ڕێکدەکەوتن بە زار بەرامبەر یەکتر شیعریان دەگوت.

ئەم گەڕانەوە سەرنجڕاکێشە بۆ کۆن دژەمانایەکی تێدایە : چونکە شیعری تەنسۆنی تروبادورەکان زۆر بە وردی شیعرێکی زانایانەبوو، گوێگری خۆی دەویست لێی تێ بگا، هەمان شت ڕاستە بۆ شیعری میللی کە پشتی بە نەریتێکی کۆن دەبەست و فۆرمێکی ئاڵۆز و مەرجی تایبەتی خۆی هەبوو(٤). مەحاڵە لەم جۆرە مۆدێلە نزیك بینەوە، لە کاتێکدا شیعر بە کۆمەڵێك هۆکاری تایبەت بە خۆی و دەدرەکی لە ناو جۆرێك لە نەزانین دەژیێ. لەبەر ئەوە لە ناو بەرهەمی (سلامیست) تەنیا چەند پاشماوەیەکی شیعری کلاسیك دەدۆزینەوە کە دوورن لە مەرجی ژیان و درێژەدان بە خۆیان وەك کێش و ڕیتم. سەروا لە خەوی درێژی خۆی بە ئاگاهات، بەڵام کەوتە ناو بچووك بوونەوە کە تەنیا ئەمڕۆ لەو شیعرانە بەکاردەهێنرێ کە لە قوتابخانەی سەرەتایی دەخوێندرێ.(...)

### ڤروم ڤروم

بێگومان سلام کێشەیەکی خەتەری ئەوتۆ دروست ناکا بۆ ڕاهێنانێکی ناسەرەکی شیعر. هەتا بۆ ئەو دیاردەیەش نا کە من لێرە ناوم ناوە ڤروم ڤروم. مەبەست لەمە داگیرکردنی بواری شیعرە بەو شتەی کە پێی دەگوترێ ( Poesie Performance ) کە دەبێ لە پەیوەندییەکی بەهێز بێ لەگەڵ (ئەکتەری کولتووری) گشتی یان تایبەتی، کە بە شێوەیەکی شێتانە حەز لە (نمایشی زیندوو) بکا و هەوڵبدا ببێتە مۆدێکی تایبەتی بوونی شیعر، دژی نووسین بوەستێتەوە تەنیا لە پێناوی شیعر گوتن بە دەنگ. دەبینین لە بۆنەکاندا زۆر کەس وەك شاعیر خۆی دەناسێنێ، وەك لە فێستیڤالی جیهانی شیعر، ئەو شاعیرانەی کە چالاکیەکانیان پێشکەش دەکەن، شێوەیەکی تایبەتی هەیە، وەك

غلۆربوونەوە لە خوارەوەی قالّدرمەیەك، دڕاندنی دەفتەری گەورەی تەلەفۆنی شار لە سەر شانۆ، بە یارمەتی ئامێری ئەلێکرۆنی سازکردنی دەنگی تایبەتی، سکێچی تایبەتی زۆر بێ وێنە و دلگیر، کە هیچ وشەیەکی تێدا بەکار ناهێنرێ. ئەگەر موزیك دابڕێنین لە هەندێ گۆرانی وەك ڕاپ و ڕۆك و پۆپ و هی تر، ئەوەی کە دەمێنێتەوە بریتییە لە کۆمەڵێك وشەی سەر کاغەز ، ئەمەش لە دیمەنێکی هەژار زیاتر نیە.

هەموو ئەم بەرهەمانە شەرافەتمەندن، هەندێ جار سەرەنجڕاکێشن، هەندێ جار بە دەگمەن (ئەمەش شتێکی ئاساییە) چلۆنایەتییەکی هونەرییان هەیە، بەلاّم تێناگەم بۆچی ناوی لێ دەنێن شیعر ؟ بۆ ناوی موزیك نەبێ ؟ یان جیمناستیك، یان ئۆپێرا، یان سێرك، یان سکێچ، یان خۆبادان نەبێ. یەکێ لەو بەرهەمانەی کە بە بەرهەمێکی ڕەمز و نوێنەری ڤروم ڤروم دادەنرێ، (ئورسۆنات)ی کورت شویتەرز ە، ئەمەش زۆر بە وردی وەك موزیك حسێبی بۆ دەکرێ وەك لە شیعر. دەشێ ئەم گریمانەی خوارەوە پێشنیار بکەین : بە دلنیاییەوە تا ڕادەیەك نەبوونی شعر لە واقیعی ئابووری ڕێگای ئەوەمان پێ دەدا مۆدێلی وا سەرهەلّبدا کە وەك لادانێکە لە شیعر و شاعیرایەتی. شاعیرێکی لەم جۆرە، کە شیعری ئەو تەنیا دەنگە و شیعری دەنگی پێشکەش دەکا هیچ ترسێکی نیە لەو پێشبڕکێیە دڕندانەی کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە ئەگەر بیەوێ خۆی لە ناو بواری موزیك بچەسپێنێ.

## خوێندنەوە و گوتن

من پەیامبەر نیم و ناشزانم ڤروم ڤروم دەبێتە تاقە فۆرمی شیعر یان نا. بێ ئەوەی بۆ ئەو ئەنجامە دوورە برۆین، پێمwایە ترسێك لە ئارادا هەیە (بۆ من ترسێکە) ببینم ڕەهەندی زارەکی شیعر (شیعر بە دەنگ) دەستەلاّتی بالاّی هەبێ و جێگا بە کتێب لەق بکات، هەتا بە شاشەی سپیش. ئەمە وەك پەککەوتن و پاشەکشە وایە. چونکە لە فرانسا هەردەم شیعر هەبووە، شیعری زۆر خۆشیش هەبووە. سەخت بێ یان بە پێچەوانەوە، کێ لە بارەی هەمووان قسە دەکا، لە بارەی ئێوە، لە بارەی هیچ، کێ داهێنان دەکا، کێ چی نوێدەکاتەوە، کێ

سەرسوڕدەهێنێ، کێ شادمانە. ئەمە لە ناو کتێبەکان، لە ناو گۆڤارەکان، لە ناو ئەلبومەکان، لە ناو ڤیدیۆکان دەدۆزینەوە. لە ناو کتێبفرۆشییەکان دەدۆزینـەوە، (هەندێك) خۆیان لە پێـشکەش کردنـی ئەدزیـیـەوە، لـە پـشتگیری کردنـی، لـە فرۆشتنی. بیخوێنەوە، کۆپی بکە، فێری بە، وەك چۆن پێشان دەمانکرد.

ئەوەی تا ئێستا گوتوومە بۆ بەرگری کردن بووە لە : کـە شـیعر بـە زمانێـك دەنووسرێ، ئەم نووسینە بە وشە دەکرێ، بێ وشە شیعر بوونی نیە، قەسـیدەیەك کە بیەوێ شتێکی هونەری زمـان بـێ دەبـێ چـوار ڕەهەنـدی هـەبێ: بـۆ سـەر لاپەڕەیەك، بۆ دەنگ، بۆ گوێ و بۆ بینینی ناوەوە. شیعر دەبـێ بخوێندرێتـەوە و بگوترێ.

١- Jean Marie Gustave Le Clezio

٢- Le temps qu'il faut,Cognac, ١٩٨٨

٣- Seuil, Paris, ٢٠٠٢

٤- X

# کاتب یاسین، ئاژاوەگێڕێکی نەمر

## نووسینی : مارینا دا سیلڤا

کاتب یاسین بیست ساڵە مردووە بەلاّم ناووبانگی لە جەزایر بەردەوام درێژەی هەیە، لەم ماوەیە سیمینارێکی چەند ڕۆژەی بۆ تەرخان کرابوو. بەلاّم لە فرانسا هێشتا بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە. بە گوێرەی فیلمەکەی ستیڤان گاتیێ کە بۆ بیرهێنانەوەی نووسەرە، کاتب یاسین "شاعیرێکە بە سێ سێ زمان"، هەردەم وەك سەمبۆلێکە زیندوو دەمێنێتەوە دژی هەموو جۆرە ناعەدالەتییەك، ڕەمزی هوشیارییەکی ڕاپەڕیوە، بەردەوام خەون دەبینێ، بەردەکاتەوە و خۆڕاگرە. بەرهەمەکانی بێ وێنەیە، کارەکانی بەردەوامن لە گەیاندنی کاریگەری و وێناکردنی ئاسۆیەك.

شاعیری راستەقینە، هەتا لەناو بزووتنەوەیەکی پێشکەوتووخوازیش بێ، دەبێ هەڵوێستی جیاوازی خۆی پیشان بدا. ئەگەر ئەم هەڵوێستە پیشان نەدا، بێگومان دەخنکێ، ئەمەیە هەڵکەوتی شاعیر. ئەو شۆڕشی خۆی لەناو شۆڕشی سیاسی دەکا، لە ناو یاخی بوونی یاخییەکی نەمرە. کردەی سەرەکی بریتییە لەوەی لە خزمەتی خەباتی شۆڕشگێڕیدا بێ، بە دوای ڕواڵەتەکانی نەکەوێ و شیعر بۆ ئەم ڕواڵەتانە نەهۆنێتەوە. شاعیر واتە شۆڕش بە هەموو مانایا رووتەکەی، ژیان بە هەموو مانا ئاڵۆزەکەی.

ڕۆمـاننووس و شانۆنووسـێکی خـەیاڵ فـراوان و ئاینـدە بـین بـوو، بـە هـۆی ڕۆمانەکەی (ئەستێرە — نجمە) بە دامەزرێنەری ئەدەبی نوێی جەزایری دادەنـرێ، بەڵام پێش هەموو شتێك کاتب یاسین شاعیرێکی یاخی بـوو. بیـست سـاڵ دوای مردنی، هێشتا هەمان شوێنی "ئەفسانەیی" خۆی پاراسـتووە، وەك چـۆن لـەناو هەموو کۆمەڵگەیەك باوە، مەرج نیە کارەکـانی بناسـین، بـەڵام لـە نـاو ژیـانی دەروونی و ناخاتنی کۆمەڵایەتی زۆر دیـارە. لـە هـەمان کـات بـە یـەکێك لـە کەسایەتیە گرینگەکانی مێژووی فرانسی جەزایری دادەنرێ.

کاتب کە بە مانای "نووسەر" دێ لە زمانی عەرەبی، نـاوبراو لـە خێزانێکـی ڕۆشنبیری خێڵی کەبلوت لـە نـازور لـە ڕۆژهـەڵاتی جـەزایر لـە دایکبـووە. لـە ١٩٤٥/٥/٨ هێشتا ١٦ ساڵی تەواو نـەکردبوو بەشـداری لـە ڕاپـەڕینی میللـی شاری کۆنستانتین دەکا بۆ سەربەخۆیی. لە سێتیف دەگیرێ، سێ مانگ لـە ژێـر ئازار و ئەشکەنجە دەمێنێتەوە، بە تایبەتی دوای دامرکاندنەوەی یـاخی بوونێـك کە بە هێز لە ناویان برد و سـەرەنجام ٤٥ هـەزار قوربـانی لێ کەوتـەوە. دایکـی نووسەر کە لەم ڕاپەڕینە بریندار بوو بوو، هەر ئەو خۆی هانی کاتب یاسینی داوە بەرەو نەریتە ئەدەبییە میللییەکان و بەرەو شیعر بچێ، بەڵام دایکی دواتر ژیانی تێکدەچێ. ڕۆژی ١٩٤٥/٥/٨ ڕۆژێکی زۆر دیارە لە ژیانی نووسـەر، بۆ هەمیـشە ئەم ڕۆژە وەك نیشانەیەك دەمێنێتەوە لە خەبات و نووسینی کاتب یاسین.

لە ئەیلولی هـەمان سـاڵ لـە عەنابـە، شـێتانەو بـە تونـدی دەکەوێتـە داوی خۆشەویستی کچە ئامۆزایەکی خۆی بە ناوی زولەیخا، ئەم خۆشەویستییە دەبێتـە سروش و ئیلهامی ڕۆمانی "ئەستێرە" کە بە فرانسی نووسیوویەتی، بە یەکێ لە کارە ئەدەبییە گەورەکان دادەنرێ کە هەموو ئەدەبیاتی مەغریب سەراوگێڕ دەکا. ڕۆمانی "ئەستێرە" کارێکی ڕەمزی و مەجازییە، مێژووی جـەزایر دەگێڕێتـەوە، لە ڕۆمانەکانەوە بگرە تا فرانسییەکان، نووسەر باس لە خۆشەویستییەکی مەحاڵ و ئاشتبوونەوە لەگەڵ خاکی باوباپیران دەکا، هەموو ئەمەش لە ڕێگای چیرۆکێك کە باس لە ژیانی چوار لاو دەکەن : لەخدەر، موراد، ڕەشید، موسـتەفا، کـە لـە چوار دەورەی (نجمە-ئەستێرە) دەخولێنەوە بۆ گەیشتن بە خۆشەویـستی مـەحاڵ،

نەجمە وەك كچێكی لاو و پارێزراو ڕەمزی جەزایریشە كە لە ژیانێكی بەرگریدا دەژیێ دژی هەموو داگیركەرەكان لە خەباتدایە. لە بنچینەدا نووسەر باس لە كێشەی ناسنامە دەكا، ناسنامەی كەسایەتیەكان و نەتەوەیەك، ڕۆمانی "ئەستێرە" ڕۆمانێكی زۆر مەودا و فرە دەنگە.

ڕۆمانی "ئەستێرە" دەبێتە سەرچاوەیەكی هەمیشەیی لە ناو بەرهەمەكانی كاتب یاسین، لە ڕۆمانی"Polygone Etoile" بە تایبەتی زیاتر گرینگی پێدراوە، لە هەمان كات كاریگەرییەكانی لە شانۆگەرییەكانیشی دەردەكەویێ، بە تایبەتی لە (بازنەی دژایەتی كردن)دا، هەروەها لە شیعرەكانیشیدا. بۆ "مۆوا ئەبەید" كە نەكتەرێكە و بەرهەمەكانی كاتب یاسینی لا زۆر پەسندە، پێی وایە: كاتب یاسین دەرهێنەرێكی بلیمەتە و زۆر لە واقیع نزیكە و لەسەر كەسایەتییەكان زۆر بە شێرگیری كاری كردووە بۆ ئەوەی لەگەڵ بینەران بدوێن، هەڵبەت بێ ئارایش و بێ نمایشی ڕووكەش. بەكارهێنانی مەجاز و ڕەمز لە لای كاتب یاسین شتێك نیە پەنای بۆ بردبێ، بەڵكو ئەو هەردەم بە دەنگی بەرز و بە هێز بیری خۆی بەیان كردووە، لەمەش سەرچاوەكەی دەگەڕێتەوە بۆ زەخیرەی كولتووری عەرەب و موسلمانەكان.

ژیانی كاتب یاسین وەك بەرهەمەكانی بوو، ئازاد و هەرەپاس، سەرەنجراكێش و پڕ لە ڕەمز و گەشانەوە. بە هەموو گیانی لەگەڵ سەربەخۆیی جەزایردا بوو، سەرەتا لەگەڵ "پارتی میللی جەزایری" بوو پاشان لەگەڵ "پارتی كۆمۆنیستی جەزایر". پێش هەموو شتێك دەچێتە ریزی "ئازاردراوەكانی خاك" ئارەزووی ئەوە دەكا خەبات بناسێ و بیناسێنێ بە جیهان، بۆ گەیشتن بە ئاسۆی جیهان، دەبێ لە بارەی فەلەستین قسە بكەین، باس لە ڤێتنام بكەین، هەڵبەت بە تێپەڕین بە مەغریب.

ساڵی ١٩٥١ لە جەزایر دوور دەخرێتەوە بۆ فرانسا، تا كۆتایی جەنگی سەربەخۆیی (١٩٥٤-١٩٦٢) لە ناو هەژارییەكی زۆر سەخت دەژیێ، بەردەوامیش لە لایەن پۆلیسی DST ی فرانسی هەراسان دەكرێ و دەخرێتە ژێر چاودێری. لەم ماوەیەش سەفەری زۆر دەكا. لە ساڵی ١٩٦٢ ، ساڵی

سەربەخۆیی دەگەڕێتەوە جەزایر، هەر زوو دووچاری جۆرێك لە بێ هیوایی دەبێ. لەم ماوەیە لە جەزایر هەستی ئەوەی لا دروست دەبێ وەك ئەوەی یەكێك بێ لە (مەریخ)ەوە هاتبێ. لێرەشەوە كۆمەڵێك سەفەری تر دەكا. مۆسكۆ، هانۆی، دیمەشق، نیۆیۆرك، قاهیرە، دەڵێ : لە راستیدا، قەت لەوبڕوایەدا نەبوومە كە سەربەخۆیی كۆتایی بە كێشەكان دێنێ، زۆرباش دەمزانی كە ئەمە كارێكی زۆر سەختە.

كاتێ كە دەیەوێ لە ساڵی ١٩٧٠ بەردەوام لە جەزایر بگیرسێتەوە، واز لە نووسین بە فرانسی دەهێنێ و ڕوودەكاتە شانۆگەری پێشكەشكردن بە زاری مەحەلی جەزایر. ناسراوترین شانۆگەری ئەم ئەزموونەی : "محەمەد جانتاكەت هەڵگرە" یە كە زۆرجوان شێوازی ئەو پیشان دەدا. كۆمەڵەی ACT ی شانۆیی دادەمەزرێنێ (كردەی كولتووری كارگەران)، شانۆگەری لە شوێنە هەرە لە بیركراوەكان پیشان دەدا وەك : كارگەكان، پادگاكان، عەمبارەكان، ستادەكان، چوارڕیانە گشتییەكانی ناو شار، هەموو ئەمانەش بە بەكارهێنانی كەرستەی زۆر سادە و زۆر كەم، ئەكتەرەكان لەسەر شانۆ خۆیان دەگۆڕن و ڕۆڵی كۆمەڵێك كەسایەتی دەگێڕن، سرود و موزیك وەك پاڵپشتێكی ریتم و ئیلهام وەرگرتن بە كاردەهێنرێ.

(كاتێ كە رۆمان و شیعرم دەنووسی، هەستم بە بێ توانایی خۆم دەكرد چونكە نەمدەتوانی دەنگم بگەیەنمە زیاتر لە چەند هەزار فرانسی زانێك، بەڵام لە ڕێگای شانۆ، لە ماوەی پێنج ساڵ پێنج ملیۆن بینەر توانیان شانۆ ببینن (...) من دژی ئەوەم لە جەزایر زمانی عەرەبی كلاسیكی بەكاربهێنرێ، چونكە ئەمە زمانی میللەتی ئێمە نیە، حەزدەكەم خۆم بگەیەنمە هەموو گەلی جەزایر بە تەواوی، هەتا نەخوێندەوارەكانیش، حەزدەكەم خۆم بگەیەنمە بینەرانی زۆر، هەر تەنیا لاوەكان نا، بینەرانی نەخوێندەواریش. دەبێ شۆڕشێكی ڕاستەقینەی كولتووری بەرپابكەین. (٣).

خەباتی سیاسی كاتب یاسین ڕاستەوخۆ ڕوانینی جوانیناسی ئەوی دیاریكردووە : ( شانۆی ئێمە، شانۆی خەباتە، لە نێو خەباتی چینایەتی توانای

هەڵبژاردنی چەکی خۆمان نیە. شانۆ هی ئێمەیە، ناشێ بەرامبەر بە گەل گفتوگۆ بکەین، ئەوەی پیشان دەدەینەوە کە بینویەتی. ئێمە هەزاران کێشە لە یەك ئەزموون کۆ دەکەینەوە. دوور دەڕۆین، ئەمەش هەموو شتێکە. ئێمە هێشتا ژیان فێردەبین. (٤). بۆ ئەو، تەنیا شیعر دەتوانێ هەست بەمە بکا. شیعر مەڵبەندی هەموو شتێکە (بە راستی شیعر دیاردەیەکی جەوهەرییە لە زمانی مرۆڤ) بە هۆی وێنە و سەمبۆلەکان، مەودای تر دەبنەوە. (چیتر تەجریدێکی بێ ئومێدی شیعرێکی داخراو بە سەر خۆی سەرچاوەی بێهێزی نیە، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە (...) لە هەموو حاڵەتێك باوەڕم بە توانای داهێنەرانەی ئەو شیعرە هەیە، بە هەمان ئاستی شانۆیەکی هوشیار و زمان کۆنترۆلکراو و باش بەکارهێنراو) (٥)

"توانای داهێنەرانە" ئایدیایەکە نووسەر لە شانۆگەری (تەرمە گەمارۆدراوەکان) بە کاری هێناوە، کە زیاتر ئاماژەیە بە ڕۆژی ١٩٤٥/٥/٨ کە سێ شار بە دەستی سوپای کۆلۆنیالی فرانسی وێران کران : گێلما، خەراتە، سێتیف، نووسەر دەیەوێ لەم بەرهەمە مێژووی کەسایەتی و تاکەکەسی بە مێژووی کۆمەلانی خەڵك گرێبداتەوە.

کاتب یاسین کۆلۆنیالیزاسیۆن و کۆلۆنیالیزاسیۆنی نوێ و بە هەمان ئاست رژێمی دیکتاتۆری دوای سەربەخۆیی دادگایی دەکا کە ئەوانیش بە شێوەیەکی تر بەردەوام بوون لە چەوساندنەوەی گەل. زۆر بە هێز دژی فەناتیزمی عەرەبی ئیسلامی دەوەستێتەوە، لە هەموو بەرەیەك و بە هەموو شێوەیەك خەبات دەکا و بەردەوام دەڵێ : پێویستە شۆڕش بەسەر شۆڕشدا بکرێتەوە.

کاتب یاسین کە زمانی فرەنسی بە (تالانی شەڕ) بۆ جەزایر لەقەڵەم دەدا، لە هەمان کات دژی سیاسەتی بە عەرەبکردن وەستاوەتەوە و بە زمانی نەتەوایەتی خۆی دانەناوە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدابوو لەهجەی عەرەبی مەحەلی و زمانی ئەمازیغ (بێربێر) زمانی نەتەوایەتی جەزایرە. ناوی لە "ئیسلامە کۆنەپارێزەکان" نابوو (برایانی مەزارگە)، بانگی بۆ ئازادی ژنان دەدا، بە لای ئەو ژنان مێژوو هەڵگرن و هەر خۆشیان دەتوانن ئەم رۆڵە بگێڕن : "کێشەی ژنی جەزایری

بەردەوام سەرەنجی منی راکێشاوە. لەوەتەی منداڵم هەست بە بایەخ و گرینگی دەکەم. هەموو ژیانم، ئەوەی تا ئێستا کردوومە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دایکم(...)لە بارەی زمانەوە، لە بارەی هوشیاربوونەوەی، دایکی یەکەم وشەی فێر کردووە، تەنیا دایکییەتی کە جیهانی ئەوی دروست کردووە.(٦).

بە هێزی ڕەخنەی ئەو وایکردبوو بە قەد سۆز و خۆشەویستی، رقیان لێ بێتەوە. ئەمڕۆ کە کاتب یاسین سەرنجی هەموو لایەك رادەکێشێ، بە چاك و بە خراپ، ئەو هەمیشە وەك "ئاژاوەگێڕێکی ئەمر" دەمێنێتەوە، هەر وەك "نەجمە" ئەستێرەیەکە پارێزراوە، لە هەموو حاڵەتێك ناکرێ لە نرخی کەم بێتەوە.

---

١- Dialogue avec Jean-Serreau, dans Le Poete comme un boxeur, Seuil, Paris, ١٩٩٤

٢- Bernard Mediene, Professeur des universities, auteur de Kateb Yacine, le Coeur entre les dents, preface de Gille Perrault. Robert Lafont, Paris, ٢٠٠٦.

٣- Entretien avec Abdelkader Djeghloul, Actualite de l'mmigration n ٧٢, Paris, janvier ١٩٨٧

٤- Colette Godard, Le theatre algerien de Kateb Yacine, Le Monde, ١١ sept. ١٩٧٥.

٥- Kateb Yacine, Pourquoi j'ai ecrit Le cadaver encircle. France Observateur, Paris, ١٩٥٨.

٦- Entretien avec El Hassar Benali (١٩٧٢) dans Parceque c'est une femme, Edition des Femmes-Antoinette Fouque, Paris, ٢٠٠٤.

# له ستایشی پێکەنینی گاڵتەپێکەر

## پییێر رامبێر

لـە کۆتـایی سـاڵی ١٩٩٩ نووسـەر گونتـەر گـراس لـە ماڵەکـەی خـۆی لە :لوبێك" پێشوازی لە سۆسیۆلۆگ پییێر بۆردیو دەکا. هەردووکیان گفتوگۆ لـە بارەی کێشە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی سەردەمی خۆیان دەکـەن و بەسـەر زۆر شتدا دەچنەوە. سەرەتا بە بێزاری پاشان لە ناکاو گفتگۆ رێڕەوی چـالاکانەی خۆی وەردەگرێ و بۆردیو دەڵێ :

"بیستوومە ئێوە گاڵتە نازانن. بەڵام سەردەمەکەمان بە راسـتی سـەختە، بۆیـە شتێك نیە بۆ پێکەنین."

گراس وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: من بانگەشەی ئەوەم نەکردووە لە سـەردەمێکی سەیر و سەخت دەژین. ئەو پێکەنینـە جەهەنەمییـەی بـە ئـەدەب دەریـدەبڕین، ئەمەش پرۆتێستۆیەکە دژی ئەو بارە کۆمەڵایەتیەی تێیدا دەژین!

گراس کە بە سەرکێشییەکانی گارگانتوا و جیهانی فرانسوا رابلـێ نووسـەری فرەنسی ئاشنایە بە رێکەوت باس لـە لایـەنی ڕوونـاکی پرۆتێـستۆکاری گیـانی تەوس و تەنز یان گاڵتەجاری ناکا.

ئەم پێکەنینە جەهەنەمییە هیچ پەیوەندی بە خولیا و سەرگەرمی ئەوانەوە نیە ماوەیەکی خۆش و خۆلەبیرکەر پێشکەش بە خەڵك دەکەن، هەروا پەیوەندی بەو پێکەنیناشەوە نیە کە مەودایەکی کۆمەڵایەتیان هەیە کە نیشانەی خەڵکە هاوتا و هاوناستی یەکەکانن لە پەیوەندی لە نێوان خۆیان، دواجار پەیوەندی بەو پێکەنینە ڕەخنەئامێزانەشەوە نیە کە ناووبانگی خۆی لە سەر رووخاندنی ناووبانگی زلهێزەکانەوە دامەزراندووە. مەسەلەکە هەمووی پەیوەندی بە پێکەنینی رام نەکراوەوە هەیە کە نەریتێکی هەزار ساڵەی لە پشتە.

لە کام مەرج و هەلکەوتدا پێکەنین ئامێز و هۆیەکی بەرگری پێشکەش بە چەوساوەکان دەکا؟ ئەگەر بنچینە و بنەمایەکی میللیانەی هەبێ؟ ئەگەر دەنگدانەوەی روانینێکی سەرتاپاگیری بۆ جیهان ئازاد بکا، ئەگەر دواجار، لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی پەیوەندییەکی هەڵبگێڕەوەی هەبێ. سێ بابەت لەم بارەیەوە لە لایەن مێژوونووسی ئەدەب میخایل باختین لە گوتارێکی ناسراو بە ناوی: کارەکانی فرانسوا رابلێ (١) گەشەی پێدراوە، کە لە ناوەڕاستی ساڵانی ١٩٦٠ بلاّوکراوەتەوە.

باختینی زانای رووسی لەم گوتارە کولتووری کۆمێدی میللی سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی بووژانەوە شی دەکاتەوە.

لە هەموو ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست، ئەم کولتورە بووژانەوە و دەوڵەمەندی خۆی هەبوو. نە کۆنترۆلی دەستەڵاتی فیۆدالی لەسەر جەستە نە دەستەڵاتی کلێسا لەسەر گیان و دەروون بەربەست نەبوون لە پێش جەژن و شادمانیە گشتییەکان. وەك : کەرنەڤالەکان، جەژنی Charivaris ، کە جەژنێك بوو گەڕەلاوژە و ئاپۆڕەی تێدابوو و ڕێگا بە زۆر شت دەدرا بیکەن، داوەتکردن و سفرە رازاندنەوەکان، مەراسیمە تەنزئامێزەکان کە لە جەژنەکانی Saturnales romaines ساتورن (زوحەل)ی رۆمانەکان دەرچووبوو(لەم جەژنەش، خەڵکەکە ئازادی خۆیان وەردەگرت و ڕێگا بە زۆر شت دەدرا، کۆیلەکان دەیانتوانی قسە بکەن و هەندێك چێژ وەرگرن، کەس لەم رۆژانە کاری نەدەکرد، ئەمەش بۆ ماوەی سێ رۆژ. وەرگێڕ)، لەمەوە تا دەگاتە جەژنی

مەراسمیە ئایینیەکانی کاتۆلیکی کە کۆمەڵێك خەڵکیان کۆدەکردەوە. لەم جەژنانە لە ناکاو کورتەباڵاکان و پیاوە زەبەلاحەکان و موهەریجەکان (لێبوك) دەڕژانە ناو گۆڕەپانە گشتییەکان، ئەمانە هەموو نیشانەی ریتمی ژیانی جوتێری بوون (بەروبووم لێکردنەوە و دروێنەکردن)، نوێبوونەوەی وەرزەکان، هەروەها لە پێش و لە پاش بە رۆژووبوون.

گاڵتەجاڕی تر کە بە شێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندی بە کلێساوە هەبوو وەك : جەژنی شێتەکان، جەژنی گوێدرێژ، پێکەنینی قوربان (لە کاتی جەژنی قوربان) بەرپا دەکرا. لەمەش دەبوایە دەستەی باڵای پیاوە ئایینەیەکان بەشداری بکەن، لێرەوە (پاپای شێتەکان) هەڵدەبژێردرا. جل و بەرگی کاهینە ئایینیەکانیان لەبەر دەکرد و بە دەم گۆرانی گوتنێکی گاڵتەجاڕانە دەچوونە سەر عەرشی کەنیسە سجوقی ئەستوریان هەڵدەلووشی. کاهینەکە (نوێژی گوێدرێژی) پێشکەش دەکرد، هەڵبەت بە ئامادەبوونی گیانلەبەرەکە خۆی، پاشان ئاهەنگ بە "زەڕین" لە جیاتی "ئامین" کۆتایی پێ دەهات. بە چەشنێکی تریش، پیاوە ئاینییەکە تەنز و چیرۆکی بێ مانا و پڕ لە گاڵتەجاڕی دەگێڕایەوە بۆ ئەوەی چالاکیان بکاتەوە، گوایە رۆژوو گرتن ماندوویانی کردوون.

ئەم نمایشە نیمچە رەسمی و رێکاپێدراوانە چەند هەفتەیەك لە ساڵدا درێژەی دەکێشا، لە شارە گەورەکان تا سێ مانگ دەڕۆیشت. ئایا وەك هۆکارێکی ئاسایش بوو ؟ هەڵبەت بە دڵنیاییەوە. بەڵام گرینگیەکانی ناشێ تەنیا لەم خاڵەی دوایی کۆبکەینەوە. چونکە: (ئەم نمایشکردن و خۆپیشاندانە "کەرنڤال و جەژنەکان" وا دەهاتنە بەرچاو لە تەنیشت جیهانە رەسمییەکە جیهانێکی تر و ژیانێکی تریان بنیات نابێ کە هەموو پیاوەکان لە چاخەکانی ناوەڕاست بە ئاستی جیاجیا تێوەگلابوون، کە تیایاندا چەند رۆژێکی دیاریکراو بەم شێوە دەژیان. هەروەکو باختین بۆی دەچێ ئەم حاڵەتە دووفاقی جیهان پیشان دەدا) ئەمەش نەك وەك کودەتایەك لە ناوەوەی دەسەڵات بەڵکو وەك بە کردەکردنێکی ئەمەن کورت و خێرای ئوتۆپییەك (خەیاڵی)، لە سەردەمێکی مێژوویی کە

گەشەسەندنی هێزەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی ڕێگایان بە وەرگەڕاندنی ڕژێم نەدەدا.

ئەم جیهانەی تر بە شێوەیەکی بەرجەستە و هەست پێکراو لە کەرنەڤال دەردەکەوت و کۆمەڵگەی کولتووری کۆمێدی سەدەکانی ناوەڕاست بوو. گۆڕەپانە گشتییەکان شوێنی هەڵبژاردن بوون، بە پێچەوانەی شەقامە نوێیەکانی ئەمڕۆ، لە هەموو وەختێك بینەرانی ئامادەی خۆیان هەبوو. (خەڵکی پێشتر ئامادە)(٢) هەموو لە کەرنەڤال بەشداریان دەکرد، زاناو نەزان، گوندی و پیادەکان، ئەندامانی دەستە پیشەییەکان، پیر و لاو، ژن و پیاو، لە کەرنەڤال (جیاوازی و جوداکاری لە نێوان ئەکتەر و بینەر نەدەکرد) کەرنەڤال دیمەنێك نەبوو بۆ بینین بەڵکو دیاردەیەك بوو ژیاری و خەڵکەکە تێیدا دەژیان، (بە درێژایی جەژن خەڵکەکە گوێڕایەڵی ڕێساکانی بوون، واتە ڕێساکانی ئازادی)

هەروەکو چۆن کەرنەڤال ڕەخنەی گاڵتەپێکەری بە دەزگاکان و سەردارەکان دەکرد، بە هەمان شێوە پێکەنینی کەرنەڤالی پەیوەندی کۆمەڵایەتی نوێی دادەهێنا. لە کاتی جەژن، بەربەستە کۆمەڵایەتی و هەرەمییەکان لە نێوان بەشداران لە هەموو چین و توێژێك بە قازانجی پەیوەندی یەکسان و ئازاد ڕەش دەبوونەوە. سەرەنجام بە هۆی ئەم پەیوەندییە تازانەوە زمان و شێوازێکی تری نوێ و ناسراو کە لە قسەی ناشرین و جوێن و پلار پێکهاتبوو و دروست دەبوو. هەموو ئەمانە ئەنجامی سیستەمێکی نوێنەرایەتی کردنی لە ڕادەبەدەری جەستە و خواردن و خواردنەوە و ژیانی سێکسی بوون. کەچی جەژنە ڕەسمییەکان ستایشی ڕابردوویان دەکرد بۆ کۆنترۆڵکردنی ئێستا، کەرنەڤال گاڵتەی بە ئێستا دەکرد و پێشبینی ئایندەیەکی بە پیت و بەرەکەتیشی دەکرد. ڕوانین بۆ جیهان لە ڕوانگەی ئاهەنگە میللییەکان سەر بۆ لۆژیکی هەڵگەڕاندنەوە دادەنوێنێ. ستایشی داستانی پاڵەوانی کومێدی دەکرێ کە خاسیەتە فیزیکی و ئەخلاقییەکانی تەواو پێچەوانەی ڕێسا ڕەسمییەکان بوو. تیایدا ئەوانە دەدۆزرانەوە کە خۆیان لە ناو جل و بەرگی تایبەتی دەشاردەوە، یان جل و بەرگیان بە پێچەوانەوە دەپۆشی. هەموو ئەوانەی لە ڕژێمی باو هەبوون ڕەمزی (باڵا) بوون (ئەقڵ، ئاسمان،

شێلگیری "جدییەت"، ڕەسمی، توندوتۆڵی) بە سەراوبنی دەبینران، هەروەکو باختین پێی وایە پەیوەندی بە (خوارەوەی ماددی و جەستەییەوە) هەیە. "خوارەوە" پێکهاتووە لە "ورگ و سێکس و زەوی"، ئەمانەش بریتین لە وەزیفەکانی "فڕێدان زۆربوون و گەشەسەندن" لەمەشەوە هێنانەخوارەوەی سەرەوەی ئەقڵی بەرەو سك و زەوی واتە لە گۆڕانی توێژە دەستەڵاتدار و گرینگەکان، لە هەمان بزووتنەوەش فڕێدانی تۆیە بۆ لە دایکبوونێکی تری نوێ، لە ڕاستیدا، پێکەنینی کەرنەڤالی (دوولایەنە) لە یەك کاتدا خۆشەییەکی پڕ لە شادمانییە، لە هەمان کات گاڵتەپێکەر و پڕ لە تەوسە، نەفی و ئەرێنییە، لە گۆڕنەر و زیندووکەرەوەیە.

کودەتای کەرنەڤالی بە تایبەتی دژی ئەقڵی توند و شێلگیرە. ئەمەش لە سەدەکانی ناوەڕاست لەگەڵ کولتووری ڕەسمی تێکەڵ دەبوو. لێرەوە ئەقڵێك دەستەڵاتی پەیدا دەکرد و بە هەرمێن دەبوو کە داوای لە (گەل...) دەکرد دەستی خۆی بگرێتەوە و ڕوو لە خواپەرستی بکا و چاوەڕێی ڕۆژی ڕزگاری بکاو مل بۆ نازارەکان و ترس لە خودا شۆڕ بکا. ئەمەش بە شێوەیەکی توند و تۆڵ خراوەتە ڕوو. (زمانی توند و شێلگیر وەك تاقە فۆرم و ڕێگا پیشاندراوە بتوانێ هەقیقەت و چاکە و هەموو شتێکی گرینگ و مەزن بخاتەڕوو) ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ هەمان شت دووبارە بکەینەوە، دەبینین زانکۆ و خاوەنکار و پیاوی سیاسی شەرعییەتی خۆیان لەسەر هەمان زمانی توند و تۆڵ و شێلگیر دادەمەزرێنن، ئەمەش دیاردەیەکە سروشتی نییە. لە گریکی (یۆنان) کۆن شاعیر و فەیلەسوفەکان ئەوەندە پێدەکەنین دەمردن، لە لای سوکرات پێکەنین هۆیەکی فێرکردن بوو، لە لای ئەریستۆفان چەکێکی سیاسی بوو. بەڵام لە سەدەکانی ناوەڕاست دەستەڵات پێکەنینی قەدەغە دەکرد لە بۆنە فیکرییە (باڵاکان).

هەمان ئەم مەسەلە هەستیارەیە لە ڕۆمانی (ناوی گوڵ) ی ئومبێرتۆ ئێکۆ خراوەتەڕوو کە ڕووداوی چیرۆکەکە لە دەوروبەری ئەو پرسیارە ئایینیە کلاسیکییە دەخولێتەوە: ئاسا مەسیح پێکەنیوە. (٣)

کاتێ کە (بەرز، باڵا) ی توند و تۆڵ و شێلگیر بە زمانی (خوارەوە) لێکدەدرێتەوە، روانینی کەرنەڤالی جیهان بەسەر نەفرەتی خودایی و ترس لە کارەساتی گەردونی دەکەوێ و لێی ڕەت دەبێ (توند و شێلگیر لەگەڵ چەوساندنەوە تۆقین و زنجیرکردن و بە درۆخستنەوە لە رێ لادان بوو، پیسکە و لاواز بوو. لە گۆرەپانە گشتییەکان، لە کاتی جەژن و کەرنەڤال، لە بەرامبەر سفرەیەکی دەوڵەمەند، زمانی توند و شێلگیر وەك ماسکێك فڕێ دەدرا و لێرەوە هەقیقەتێکی ترمان دەبیست) هەقیقەتی گاڵتەپێکەر و ئازاد، هی (جیهانێکی سەراوبن)

ئەم سەرکەوتنە بەسەر ترس وێڕای ئازادبوونی ئەقڵ گەشە دەکا. لە رێگای کردنەوەی گرێ کوێرەکانی زمانی توندوشێلگیری، فۆرمە کۆمێدییە میللییەکان، (ئاگایی و بیر و خەیاڵی مرۆڤایەتی رزگار دەکەن و خۆیان تەدارەك دەکەن بۆ شیمانەی (احتمال) تری نوێ) ، ئەمەش لە پێناوی کودەتای تری نوێ کە ئامانجی تەنیا ئەوە نەبێ وەرگەڕاندنی تەمەن کورتی رەمزەکانی دەستەڵات بێ، بەڵکو وەرگەڕاندنی هەقیقی سیستەمی کۆمەڵایەتی بێ، مانگرتن جێگای کەرنەڤال دەگرێتەوە وەك ئەتۆلییەکی (ورشە) خەیاڵی توانادار بتوانێ ڕوانگەی (جیهانێکی تەواو جیاواز بە مادی بکا بۆ سیستەمێکی جیهانی تر و بونیادی ژیانێکی تر).

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم، کولتووری کۆمێدی میللی گۆڕوتینێکی زۆر دەستێنێ و بڵاودەبێتەوە، بەرەو جغزێکی تەسك دەگەڕێتەوە، هەڵبەت بە هۆی خنکانی بە بوار و ژیانی گشتی. ڕۆڵی ئەرێنی نامێنێ، کەرنڤال مانای (دوولایەنە)ی خۆی بزر دەکا تەنیا وەك کاریکاتۆر دەردەکەوێ و دەبێتە (نەفی- یەکی سادە.) بەڵام پێش ئەوەی ئاوابێ، ریالیزمی گاڵتەجاڕی لە کارە ئەدەبیە کلاسیکییەکان بە قووڵی دەردەکەوێ، رابلێ و شکسپیر و سێرڤانتێس ئەدیبانی کەرنەڤال بوون.

باختین پێی وایە (هەموو بواری ئەدەبی ریالیست لەم سێ سەدەی دوایی پڕە لە پاشماوەی ریالیزمی گاڵتەجاڕی) ڤیکتۆر هوگۆ لە لاپەڕەکانی یەکەمی ڕۆمانی (نۆتردام دو پاری) باس لە جەژنی شێتەکان دەکا، بیۆتۆلت برێخت لە "ئۆپێرای

چوار عانە" گونتەر گراس لـە رۆمـانی "تـەمبوور" بـاس لـەوە دەکـەن. ئایـا پێکەنین پرۆتێستۆیەکە دژی مەرج و باری کۆمەلآیەتیمان؟ لەو خۆپیـشاندانانەی گەل دەرژێتە سەر جادەکان و تەحەدای دەستەلآت دەکا، بە ماسك و کاریکاتۆر و سلۆگانی کۆمێدی، هەندێك لە لایەنەکانی کەرنەڤالی تێدا هەسـت پـێ دەکـرێ. کێ بوو گوتی ئایاپێکەنینی گالتەپێکەر و پڕ لە تەوس و پلار کە لە یەك کاتـدا لە ناوبەر و نوێکەرەوەیە، لە گۆڕەپانە گشتییەکان بانگی سـەردەمێکی دیکـەی نوێ بلآوناکاتەوە؟

١- Mikhaïl Bakhtine, *L'Œuvre de François Rabelais et la culture populaire au Moyen Age et sous la Renaissance*, Gallimard, « Tel », Paris, ١٩٨٢ (١٩٦٥). Sauf mention contraire, les citations qui suivent en sont extraites.

٢- André Belleau, « Carnavalesque pas mort ? », *Etudes françaises*, vol. ٢٠, n° ١, ١٩٨٤, p. ٤٠.

٣- Lire Jacques Le Goff, « Rire au Moyen Age », *Les Cahiers du Centre de recherches historiques,* n° ٣, ١٩٨٩.

# هەر دوو کەسایەتیەکەی ماریۆ ڤارگاس یۆسا

## ئیناسیۆ رامۆنیٚ

رۆمانە تازەکەی ماریۆ ڤارگاس یۆسا براوەی(١) خەلاتی نۆبلی ٢٠١٠، لە کاتێکی گونجاودا (٣ نۆڤەمبەر) دەکەوێتە کتێبخانەکانی ولاتانی ئیسپانی زمان.

ئەم رۆمانە تازەیەی نووسەر بە ناوی (خەونی سێلتی یان خەونی سێلتییەك)ە، پالەوانی ئەم رۆمانە کەسێکی راستەقینە و دەگمەنە بە ناوی "رۆجێ کاسمە" کە کۆنسولی بەریتانی بوو لە ئەفریقیا، یەکەمین کەس کە راستەوخۆ هەر لە سالی ١٩٠٨ ەوە دژایەتی لە ناوبردن و رەشەکوژی و قەتلوعامی کۆلۆنیالیزی کرد، کە لە لایەن شای بەلجیکا : لیۆپۆلدی دووەم پەیرەو دەکرا و لە کۆنگۆ دە ملیۆن کەسی کوشت و لەناوبرد. شای بەلجیکا ولاتی کۆنگۆی پان و بەرین و دانیشتوانەکەی کردبووە مولکی تاکەکەسی خۆی... لە راپۆرتێکی تری "رۆجێ کاسمە" پەردە لەسەر ترس و نیگەرانی و تۆقینی هیندییەکانی ئەمازۆنی پێرویی هەلدەداتەوە.

رۆجێ کاسمە لە پێشەنگانی بەرگریکارانی مافی مرۆڤ بووە، لە نزیك شاری دبلن لە دایك بووە، پاشان دەچێتە ریزەکانی سەربەخۆخوازانی ئایەرلەندی. لە ناوەراستی جەنگی جیهانی یەکەم دەلێ : سەختی و نالەباری ئینگلستان فرسەتێکە بۆ ئایەرلەندا، بۆیە ئەم هەلە دەقۆزێتەوە و بە دوای هاوپەیمانی لەگەل ئەلمانەکان دەگەرێ بۆ خەبات کردن دژی ئینگلستان. لەبەر ئەمە بە خیانەتی مەزن تاوانبار دەکرێ. دەستەلاتی ئینگلیستان بە (هۆمۆسێکسوێل) یش

تاوانباری دەکا، ئەمەش گوایە لە دەفتەری یاداشتەکانی خۆی دەرهێنراوە، بەڵام گومان لەم تاوانبارکردنە دەکرا. رۆجێ کاسمە لە ٣/٨/ ١٩١٦ لە داردرا.

لەبەر ئەوەی هێشتا رۆمانەکە لەبەر دەست نیە، ناتوانین بزانین ساختمان و رۆنانی ئەم رۆمانە نوێیەی نووسەر چۆنە، بەلاّم دەتوانین لێی دڵنیابین. هیچ رۆمان نووسێکی ئیسپانی زمان وەك ئەو ناتوانێ خوێنەر بۆ خۆی رابکێشێ، هەر لە یەکەم دێرەوە سەرنجی خوێنەر بۆ خۆی دەبا و بەرەو قووڵایی رایدەکێشێ و بەرز و نزمی دەکاتەوە، چیرۆك و گرێ بە دوای یەکتری دادێن کە پڕن لە سۆز و سەلیقە و وەحشییەت و ئیرۆتیزم. یەکێ لە لایەنە دیار و بە نرخەکانی ئەم رۆمانە، زیندووکردنەوەی رۆجێ کاسمەیە کە لە بیرکرابوو(کە لە یەکەمین ئەو ئۆروپیانە بوو روانینێکی زۆر روونیان لە بارەی سروشتی کۆلۆنیالیزم و خەسڵەتە وەحشیگەریەکەی هەبوو)(٢)، نووسەر پشتگیری لەم روانینە دەکا (ئەگەرچی خۆی دژی بزووتنەوەی خەڵکە رەسەنەکانی ئەمریکای لاتینە) کە پێی وایە : "هیچ وەحشیگەری و بەربەرییەك بە کۆلۆنیالیزم بەراورد ناکرێ". راستەوخۆ ئەو بۆچوونەش رەت دەکاتەوە کە گوایە کۆلۆنیالیزم لایەنی (سوودمەندی) هەبووە، بەلاّم ئەو پێی وایە ئەفریقیا قەت نەیتوانی لە سەر ئێسك و پروسکی خۆی زیندوو بێتەوە. کۆلۆنیزاسیۆن هیچ شتێکی ئەرێنی (پۆزەتیڤ)ی بەجێ نەهێشتووە(٣).

ئەمە یەکەم جار نیە کە ماریۆ ڤارگاس یۆسا سوود لە کەسایەتیە مێژوویەکان وەردەگرێ بۆ دژایەتی کردنی ناعەدالەتی. ئەو شارەزایە لە تێکەڵ کردنی تەکنیکی رۆمانی مێژوویی بە هی کۆمەلاّیەتی و ریالیزمی، تا دەگاتە رۆمانی پۆلیسیش. ئەمەش لە دوو رۆمانی ئەو بە سەرکەوتوویی ئەنجام دراوە. رۆمانی "جەنگی کۆتایی جیهان" کە رۆمانێکی زۆر سەرنجڕاکێشە لە بارەی شۆرش و راپەڕینی باکوری رۆژهەلاّتی بەرازیل لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم، کە تێیدا باس لە کۆمەڵە خەڵکێکی کریستیانی گەشبین دەکا کە بە دوای دروست کردنی جیهانێکی ئۆتۆپی (خەیاڵی) وێڵن. رۆمانی دووەم(٤) بە ناوی (جەژنی نێری- bouc)یە. ( ئەم وشەیە لە زمانی فرەنسی بە دوو مانا دێ : ١- نێری،

٢- پیاوێکی پیس و با تێکەوتوو، بەلاّم لە لای نووسەر وەك رەمزێك بۆ دیکتاتۆر بەکارهاتووە، کە پیاوێکی مێشك بۆگەن و شەبەقی و پیسە. وەرگێڕ) نووسەر لەم رۆمانە بە دارشتنێکی سەرنجراکێش و کۆراڵی و فرەدەنگی باس لە دیکتاتۆر جەنەراڵ تروژیلۆی کۆماری دۆمینیکان (١٩٣٠-١٩٦٠) دەکا.

مێژووی هاوچەرخیش بابەتی رۆمانێکی تری نووسەرە کە بە شاکاری ئەو لە قەلەم دەدرێ، ئەمەش رۆمانی (گفتوگۆ لە کاتێدرال)ە، نووسەر زۆر بە جوانی و بێ نموونەیی باس لە ولاّتەکەی پێرو لە سەردەمی جەنەراڵ ئۆیدریا (١٩٤٨-١٩٥٦) دەکا، باس لە ژیانی ئەمریکای لاتین دەکا لە ساڵانی پەنجاکان و نهێنیەکانی چارەنووسی مرۆڤایەتی. ناوەڕۆکی ئەم رۆمانەش لەگەڵ روانینی هەڵبژێرەرانی خەلاّتی نۆبل تێکدەکاتەوە و بۆتە هۆی وەرگرتنی خەلاّتەکە کە نەخشەی سترەکتوری دەستەلاّت و نوێنەرایەتی کردنی بەرگری، راپەڕین و شکانی تاکەکەس دەخاتە ڕوو.

ئەو کاتەی نووسەر ئەم رۆمانەی دەنووسی لە پاریس دەژیا، سەر بەو نەوە نووسەرە لاوە بەهرەدارانە بوو وەك: گابریەل گارسیا مارکێز و ژولیۆ کۆرتەزار و کارلۆس فۆێنتێس... کە دواتر ئەدەبی ئەمریکای لاتین لەسەر دەستی ئەمانە زیندوو دەبێتەوە. ئەمانە هەموویان چەپ بوون. گشتیان سۆزیان بۆ خەباتی چەکداری هەبوو. لە یەکێ لەو مانیفێستانەی بۆ پشتگیری چەکدارانی پێرویی دژ بە رژێمی دیکتاتۆری نووسراوە، ماریۆ ڤارگاس یۆسا لەو سەردەمە دەڵێ (تاقە رێگا خەباتی چەکدارییە).

هەمان سۆز و روانینیشیان بۆ شۆرشی کوبا هەبوو، لە ١٩٦٧/٨/٤ لە کاراکاس یۆسا دەڵێ: دە ساڵی تر، بیست یان پەنجا ساڵی تر، زەنگی دادپەروەری کۆمەلاّیەتی لێ دەدا هەروەکو ئێستا لە کوبا لێ دەدا، هەموو ئەمریکای لاتین رزگاری دەبێ لەو چینانەی دەیچەوسێننەوە، لەو هێزانەی دەیخنکێنن. دەمەوێ ئەو وەختە بە زووترین کات بگا، دواجار ئەمریکای لاتین بچێتە ناو ژیانێکی شەرافەتمەند و مۆدێرن، دەبا سۆسیالیزم رزگارمان بکا لە نارێکی و تۆقێنەرەکان).

پاشان، ئەم شۆڕشگێڕە بە حەماسەتە وەك ڕۆشنبیرێك لە سەرەتای سالآنی حەفتاكان دەكەوێتە ژێر كاریگەری دوو كتێب : یەكەمیان : ڕێگای كۆیلەبوون-ی فرێدریك هایەك – F. Hayek ، دووەمیان : كۆمەڵگەی كراوە و دوژمنەكانی"ی كارل پۆپەر- C. POPER. بە تایبەتی ئەمەی دووەمیان زۆر كاریگەری لێ دەكا و دەیگۆڕێ، لەم ڕووەوە خۆی دەڵێ: لەو بڕوایەدام كارل پۆپەر گەورەترین بیریار و ڕۆشنبیری سەردەمەكەمانە، لەم بیست ساڵەی دوایی ماوەیەكی زۆرم تەرخان كردبوو بۆ خوێندنەوەی، ئەگەر لێم بپرسن كام كتێبی فەلسەفی مەزنترین كتێبی ئەم سەدەیەیە، بێ دوو دڵی و دامان ڕاستەوخۆ دەڵێم كتێبی "كۆمەڵگەی كراوە و دوژمنەكانی". دوای ئەمە ڕاستەوخۆ واز لە پشتگیری كردنی شۆڕشی كوبایی دێنێ، دژایەتی ڕابردووی خۆی دەكا كە وەك ڕۆشنبیرێكی چەپ ناسرابوو، بە باوەڕ و هێزەوە وەك كەسێكی گۆڕاو و ئیماندار بە باوەڕی نیولیبرال خۆی دەناسێنێ. پاڵەوانەكانی ئەم سەردەمە و ئەم بیركردنەوە نوێیەی بریتین لە ڕۆناڵد ریگان و مارگرێت تاتچەر. بەرامبەر بەمەی دوایی كە وەك ڕەمزی (شۆڕشی كۆنزێرڤاتۆر) سەیری دەكا، پۆسا دان بەوەدا دەنێ و دەڵێ : سۆز و هەستێكی بێ خەوشم بەرامبەری هەیە كە زۆر كاریگەری لێ كردووم، بەرامبەری هەست بە شكۆمەندییەك دەكەم چی كەمتر نیە لە هەستی منداڵێك بۆ دایكی، هەرگیز هەستێكی وام بەرامبەر بە هیچ سەركردەیەكی سیاسی نەبووە وەك بەرامبەر مارگرێت تاتچەر هەمبووە)(٥). بە هۆی كەوتنە ژێر كاریگەری تاتچەر بڕیاردەدا بچێتە لەندەن و لەوێ دابنیشێ. ئینجا كە (خانمی ئاسنین) دەستەلآت لە ساڵی ١٩٩٠ بەجێ دەهێڵێ، چەپكە گوڵێكی بۆ ڕەوان دەكا كە ئەمەی لەسەر نووسراوە : (خانم وشەكانی فەرهەنگ تێری ئەوە ناكەن سوپاستان بكەین بۆ ئەو كارانەی لە پێناوی ئازادی(٦) كردووتانە).

سەرەنجام لە كاتی هەڵبژاردن بۆ سەرۆكایەتی كردنی پیرو لە ساڵی ١٩٩٠، پرۆگرامێكی تاتچەری پێشنیار دەكا. بەلآم زۆر دڵڕەقانە لە لایەن ئەلبێرتۆ فوجیمۆری لە هەڵبژاردن دەدۆڕێنێ، سەرەنجام هەست بە بێزاری دەكا و لە هاوولآتیانی خۆی پەست دەبێ، بۆ ئێجگاری وڵات بەجێ دێڵێ و واز لە

رەگەزنامەی پێڕوییی خۆشی دێنێ بە حوجەی ئەوەی پێڕوییەکان شایانی ئەو نین...پاشان کاریگەربوونی خۆی دەگوازێتەوە بۆ سەرکردەیەکی تر، ئەمەش جۆزێ ماریا ئەزناری سەرەك وەزیرانی ئیسپانی سالآنی (١٩٩٦-٢٠٠٤)ە، کە کەسایەتیەکی (ئەوپەڕی لیبرال – Ultraliberal)ەو هاوپەیمانی سەرۆك بووش بوو لە داگیرکردنی عێراق، ئەمڕۆش کارمەندی دەزگای ( New Corporation)ی روپێرت مەردوك- ە. کەچی گۆڤاری "سیاسەتی دەرەوەی"ی ئەمریکایی جۆزێ ماریا ئەزنار بە یەکێ لە (پێنج سەرکردە هەرە خراپی جیهان) لە قەلەم دەدا، بەلاّم یۆسا لەو باوەڕەدایە (مێژوونووسانی ئاینده) وەك (یەکێ لە پیاوە گەورەکانی دەوڵەت و مێژوو)(٧) لە قەلەمی دەدەن.

بێجگە لەمانە، کەسایەتی کاریزمای نیکۆلا سارکۆزی زۆر سەرنجی رادەکێشێ و سیلڤیۆ بەرلوسکۆنی بە (بەهرەدارێکی سیاسی ناوێزە و دەگمەن) دەزانێ. ئەم نووسەرە گەورەیە پیاوێکە بە ڕاستی کەسایەتیەکی دووفاقەی هەیە. لە بن ماسکی جوانی رۆمانە سەرنجڕاکێشەکانی"بنەمایەکی سیاسی بە زۆر ئاخنراو" بە شاراوەیی دەبینرێ، ماوەی چل ساڵە، زۆربەی وەختی جوانی خۆی بۆ لێدوانی مێدیایی تەرخان کردووە. لە پلاتفۆرمەکان ئاخاوتن پێشکەش دەکا، پروپاگەندە بۆ روانینی نوێ لە جیهاندا دەکا، بە رادەیەك پرەنسیپە جەوهەرییەکانی ئیدیۆلۆژی خۆی دووبارە و سێ بارە دەکاتەوە هەندێ جار وەك فەناتیکێك دێتە بەرچاو.

چالاکوانێکی زۆر لیبراڵە، ئەندامی کۆمیسیۆنی " Trilaterale " ەو سەرۆکی "دەزگای جیهانی بۆ ئازادی" یە، برندەی خەلاّتی ( Irving Kristol )ە کە لە لایەن : American Entreprise Institute ، پێشکەش کراوە، یۆسا نیۆکۆنزێرڤاتۆرێکی پیشەییە. تەواو پشتگیری لە داگیرکردنی عێراق دەکرد و لەگەلّ ئەو کودەتایەش بوو لە حوزەیرانی ٢٠٠٩ لە هۆندوراس روویدا.

لە ٧ ئۆکتۆبەری ٢٠١٠ وتارنووسی فرەنسی رۆنالد رێگانی (گی سۆرمان) لەسەر ماڵپەڕەکەی دەنووسێ: (زۆرجار، ئێمە خۆمان لەسەر یەك هێلّ لە

ئەمریکای لاتین دەدۆزییەوە کە یۆسا میلیتانێك بوو ئێمە لە فرەنسا بە کەسێکی لیبرالمان لە قەلەم دەدا، ماندوونەبوو لە دژایەتی کردنی کاسترۆ و مۆرالێس و شاڤێز و کریشنەر و هەموو پرۆگرامێکیش بە ئاستەم سۆسیال دیمۆکرات بایە.)

یۆسا گەلێك زۆر بە رۆمان نوسی فرەنسی فێردیناند سێلین کاریگەرە و بە نووسەرێکی زۆر مەزنی دادەنێ، لە هەمان کات باوەڕیشی وایە کە نووسەری رۆمانی (سەفەر تا کۆتایی شەو) کەسایەتیەکی بێزهێنەرەوەیە. لە هەمان کاتدا ئەوەش دەڵێ : (بەلاّم زۆر کەس هەن کەسایەتیەکی بێ رێزیان هەیە لەگەلّ ئەمەش نووسەری مەزنن.)(٨).

پەراوێز ___________________________

**– ماریۆ ڤارگاس یۆسا شەشەمین نووسەری لاتینۆئەمریکاییە کە خەلاّتی نۆبلی وەرگرتووە، ئەم نووسەرانەش ئەمانەن : گابریێلا میسترال (چیلی) ١٩٤٥. ئەستوریاس (گوتیمالا) ١٩٦٧. پابلۆ نێرۆدا (چیلی) ١٩٧١. گابریەل گارسیا مارکێز (کۆلۆمبیا) ١٩٨٢. ئۆکتاڤیۆ پاز (مەکسیك) ١٩٩٠.**

١. Mario Vargas Llosa est le sixième Latino-américain à obtenir le prix Nobel de littérature après Gabriela Mistral (Chili, ١٩٤٥), Miguel Ángel Asturias (Guatemala, ١٩٦٧), Pablo Neruda (Chili, ١٩٧١), Gabriel García Márquez (Colombie, ١٩٨٢) et Octavio Paz (Mexique, ١٩٩٠).

٢. *El País*, Madrid, ٢٩ août ٢٠١٠.

٣. *Ibid.*Gallimard, Paris, ٢٠٠٢.

٤. Cité par Julio Roldán, *Vargas Llosa entre el mito y la realidad*, Tectum Verlag, Marburg, ٢٠٠٠, p.١٦١.

٥. *Ibid.*

٦. ٢٠ *minutos*, Madrid, ٦ juillet ٢٠٠٧.

٧. *Il Corriere della Sera*, Rome, 9 mars 2009.

٨. *La Nación*, Buenos Aires, ١٣ mars ٢٠٠٦.

# ڕوخسارە زۆرەکانی ئێرنست ڕێنان

*** نووسینی : هێنری لۆرەنس**

ئەریستۆکراتیزمی هەڵبژاردەی ئێرنست ڕێنان ڕۆڵێکی مەزنی گێڕاوە لە بە عەلمانی کردنی کولتووری فرانسی و ئەوروپی. زۆرێك لە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە مۆرالیست و تەوسبازە، ئەمڕۆش وێڕای چێژێکی زۆر دەخوێندرێتەوە، هەندێك لەم تێکستانە، وەك ئەوانەی شلۆمۆ ساند ماوەیەك بەر لە ئێستا لە ژێر ناوی "نەتەوە و جودایزم لە لای ئێرنست ڕێنان" لە لایەن پەخشخانەی (Les liens qui libèrent, Paris) چاپکرانەوە، بە کاری سەرنجڕاکێش دەمێننەوە و وتوویژ لە ناو بەیەك گەیشتنە هاوچەرخەکان دروست دەکەن.

*** *** ***

ئێرنست ڕێنان شکۆمەندییەکی زۆری لە سەدەی نۆزدەم بە دەست هێنا، بە تایبەتیش بە هۆی ئەو ڕەخنە "مێژووییانەی" لە ئایینی کریستیانیزمەوە دەگرت، بەڵام واپێدەچێ ئەم خەبات و ئەم گفتوگۆیانە لە بیرکرابن، چونکە هەر کە باس لەوە دەکرێ پاشماوەی لاشەی ئێرنست ڕێنان بگوازرێتەوە بۆ پانتیۆن (مەزاری پیاوە گەورەکانی فرانسا) ڕاستەوخۆ گواستنەوەکە دوادەخرێ بە هۆی پرۆتێستۆی ناوەندی کاتۆلیکی کە پێیان وایە سەرەنجام : (چوونی ڕێنان بۆ پانتیۆن وەك خەڵات و ڕێزلێ نانێك بۆ یەکێکی کافر و زەندیقی وا، قەت نابێتە

یاردیدەرێك بۆی لە بەرامبەر خودا کە خیانەتی لێ کردووە...)(١) هەرچی ڕوانینی هزرڤانە ئازادەکانە لە بارەی ئێرنست ڕێنانەوە، کەمێك بە وشیارییەوە لەم کێشەیە دەڕوانن، چونکە ئەگەرچی ڕەخنەی ئێرنست ڕێنان لە بارەی ئایین زۆر رادیکالانە بوو، بەڵام کەمتر گرینگی بە بە ڕۆلی کۆمەڵایەتی ئایین داوە و بایەخی بە روحی ئایین نەداوە کە ئەو خۆی یەکێك بوو لە نوێنەرەکانی ئەم بیرکردنەوەیە. کەواتە لێرەوە مەسەلەکە وای لێ هاتووە هەروەکو جۆرج ساند بۆی دەچێ : (ئێرنست ڕێنان هەردەم خەریکی ئەوەیە ئەوەی بە دەستێك بنیاتی دەنێ بە دەستێکی تر لە ناوەی دەبا).

ئەمڕۆ، ئێرنست ڕێنان زیاتر بە هۆی ڕاسیزم و کۆلۆنیالیزم تاوانبار دەکرێ. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لە (سیفری تەکوین) و (پرسیارکردنەوە) کە ئەو تێیدا بە ئایدیای (بە ئایینکردنەوە) دەگا، دەشێ لە پێناسە و ڕوانینی ئێرنست ڕێنان بگەین لە بارەی نەتەوە، نەژاد و جوداییزم.(٢)

ئێرنست رینان لە ساڵی ١٨٢٣ لە خێزانێکی مام ناوەندی لە دایکبووە. هاوکاری خێزانەکەی و بە دەست هێنانی بورسێکی خوێندن یارمەتی ئەوەی دەدەن خوێندن تەواو بکا و بیگەیەننە سیمینارە گەورەکانی سان سولپیس، لە سەرەتاوە بە ئامانجی خوێندنی ئایین و بوون بە کەشیش ڕاسپێردراوە، بەڵام دواتر لە ناوەوە دوچاری لێکدانەوە و بیرکردنەوەی زۆر دەبێتەوە، ئەمەش وردە وردە وای لێ دەکا لە کاتۆلیسیزم دوورکەوێتەوە. پێی باشترە بە دوای هەقیقەت بکەوێ بەو شێوەی زانست بۆی دەچێ نەك ئایین، چونکە بە ڕای ئەو ئایین بەرهەمی عاتیفە و هەڵچوونی مرۆڤە. سەرەنجام لە کاتێکدا لە ڕووی مادییەوە زۆر کەم دەرامەت بووە، سیمینارەکانی سان سولپیس بەجێدەهێڵێ و ڕوو لە دانیشگا دەکا. ئێرنست ڕێنان هەروەکو چۆن بۆ برادەرەکەی خۆی مارسێلا بێرتێلۆ لە ٢٨ /١٨٤٧/٨ نووسیویەتی،(٣) لە پرۆسەی بیرکردنەوەی لە بارەی کێشەی ئایین دەگاتە ئەو ڕوانینەی کە ئایین دەبێ نەك هەر لە ڕوانگەیەکی فەلسەفی لێی بکۆڵدرێتەوە بەڵکو دەبێ لە ڕوانگەیەکی مێژووییش، هەروەها لە ڕوانگەی ( بە ئایینکردنەوە)ش، واتە لە ڕوانگەی پرۆسێسی دروستکردنی ئایین

لێی بکۆڵدرێتەوە. بەم چەشنە لە کۆمارییەکانی سەردەمی خۆی تێبینی ئەوە دەکا کە پرۆسەی پیرۆزکردنی شۆڕشی فرانسییان هەیە : " ئەوەی ئەفرەت لە شۆڕش بکا کەسێکی بێ مانایە" . هەمان شت بۆ سۆسیالیزم، بەلاّم ئەو مەیل و دڵگیرییەکی بۆ ئەمەی دوایی هەبوو، بە تایبەتی لە سەروبەندی شۆڕشی ١٨٤٨،(٤) پێی وابوو دەبێ : مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی زانستیانە ڕێکبخرێتەوە، ئەمەش دوا وشەی زانستی مۆدێرنە، ئەمەش جورئەتی ئەوە بەلاّم گاڵە (ئیدیعا) کردنێکی شەرعییە". بەلاّم ڕاپەڕینەکانی کۆماری دووەم بەرەو ئەو ڕووگەی دەبەن لەم بۆچوونە پێشکەوتنخوازە دووربکەوێتەوە. لەوە دەترسا دیکتاتۆریەك لە پیاوە ئایینییە بەرزەکان سەرهەڵبدا لە لایەن کۆمەلانی خەڵکی نەزان پشتگیری لێ بکرێ. بەم شێوەیە ڕووداوەکانی سەردەمی کۆماری دووەم لێکدەداتەوە، لێرەوە ئێرنست ڕێنان دەبێتە کەسێکی لیبرال و پشتگیری لە تێزی ڕۆڵی زۆر پێویستی هەڵبژاردەیەکی ڕۆشنبیرە کە تەنیا بەستراوبێتەوە بە ئازادی بیرکردنەوە و چەوسابێتەوە بە فەناتیزمی ئایینی.

لێرەوە سیستەمی بیرکردنەوە و ڕۆشنبیری ئێرنست ڕێنان دەگاتە ترۆپکی پێگەیشتنی. دەیەوێ فیلۆلۆژی بکاتە زانستێکی بەرهەمەکانی ئەقڵی مرۆڤایەتی : ( فیلۆلۆژی زانستێکی پڕبە پێستی شتەکانی ئەقڵە. فیلۆلۆژی سەر بە زانستەکانی مرۆڤایەتیە هەروەکو چۆن فیزیك و کیمیك زانستی فەلسەفەی لەشن.) بە ڕای ڕێنان هەموو زمانێك تێگەیشتنێکی سەرتاپاگیری گەردوونە. لێرەوە، هەر سیستەمێکی زمانەوانی (زانستی زمان) بە شێوەیەکی گریمانەیی هەموو گەشەسەندنێکی ڕۆشنبیری تێدایە لە لای ئەو گەلەی کە ئەو زمانە بە کاردەهێنێ. بەم جۆرە بۆ ئەو، گەلانی ئاری یان هیندوئۆرۆپی گیانی فەلسەفە و زانستییان هەڵگرتووە، گەلانی سامی ئایدیای خودای تاك و تەرا. بە یەکگەیشتنی ئەم دوو ڕوانینە لە ڕێگای کریستیانیزم توانای ئەوەیان دەداتێ گەردوون(جیهان) دامەزرێنن.

ڕێنان تەواوی بەرهەمەکانی بۆ وەسف و لێکدانەوەی زمانە سامییەکان و تایبەتمەندییە ڕۆشنبیرییەکانییان تەرخان کردووە، ئەمەش بەرەو مێژووی گشتی

ڕەگ و ڕیشەکانی کریستیانیزمی دەباتەوە، پاشان دەیباتەوە سەر مێژووی گەلی جوولەکە و جارێکی تر دەیهێنێتەوە سەر دەرکەوتن و سەرهەڵدانی کریستیانیزم. کاتێ کە لە ساڵی ١٨٦٢ لە یەکەم سیمیناری خۆی لە کۆلێژ دو فرانس، باس لە کریست (مەسیح) دەکا وەك مرۆڤێکی بێ وێنە، سکاندال و هەرایەکی گەورە دەنێتەوە، لە کار ڕادەگیرێ پاشان دوور دەخرێتەوە، بەلاّم ئەم هەڵکەوتە ڕێگای ئەوەی لێ ناگرێ ساڵێك دواتر کتێبی (ژیانی کریست) بلاّوبکاتەوە، کە دەبێتە پڕفرۆشترین کتێب و ناووبانگ دەردەکا.

بە پێچەوانەوە زۆر کەم ڕوانینەکانی لەو سەردەمە لە بارەی ئیسلام لەبەرچاو گیراوە کە بە ڕای ئەو (ئیسلام بریتییە لە تەواوترین نەفی ئۆڕوپا، ئیسلام واتە فەناتیزم، وەك ئیسپانیای سەردەمی فیلیپی دووەم و ئیتالیای سەردەمی پاپا پیۆنی پێنجەم کە بە ئاستەم ناسراون، ئیسلام واتە سووکی و چرووکی زانست، ئیسلام واتە نەبوونی کۆمەڵگەی مەدەنی، ئیسلام بریتییە لە بێ ماناترین سادەیی فیکری سامییەکان، بچووککەرەوەی مێشکی مرۆڤ، داخراو بەسەر هەموو ئایدیایەکی ورد و قووڵ، دژی هەموو هەستێکی ناسك، دوور لە هەموو گەڕانێکی عەقلاّنی، ئیسلام مێشکی مرۆڤ ڕووبەڕووی بۆشترین ڕوانین دەکاتەوە کە پێی وایە : خودا خودایە.). ئەو ئیتنۆلۆژییەی (فیلۆلۆژی) ڕێنان پشتگیری لێ دەکات ڕێگای ئەوەی بۆ خۆش دەکات سیستەمی بیرکردنەوەی لەسەر ناکۆکی و پێکنەچوونی ئاری و سامی دامەزرێنێ. بۆ گروپەکانی تری مرۆڤایەتی، تەنیا هەندێ بۆچوونی هەڵسەنگێنەرانەی هەیە، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە لێکۆڵینەوەکانی خۆی هەمووی تەرخان کردووە بۆ بنچینەی مۆنۆتاییزم (یەکتاپەرستی). ئەوەی پێچەوانەی سیستەمی بیرکردنەوەی ئەو بووە ڕەفز کراوەتەوە... لێرەوە زۆرتر چەمکی نەژاد بە کاردەهێنێ، بەلاّم ئەم بەکارهێنانە نزیکترە لە چەمکی کولتوور وەك لە ڕەگەز و نەژاد بە ماناکانی خۆیان. لە لایەکی تر، ڕێنان کە بە قووڵی کەوتبووە ژێر کاریگەری کولتووری ئەڵمانی، نیگەران دەبێ لەوەی خۆی ببینێتەوە چەمکی "نەژادپەرستییەکی توندوتیژ" بەکاربهێنێ. بۆیە دەبینین لەم ڕووەوە خۆی بۆ گۆبینۆ ڕوون دەکاتەوە کە تازە

کتێبە بەناوبانگەکەی لە ساڵی ١٨٥٦ بلاّوکردبۆوە کە لە ژێر ناونیشانی (وتارێك لە بارەی نایەکسانی نەژادەکانی مرۆڤایەتی) بوو.(٥) ڕێنان پێی وایە : ( لە بنچینەدا مەسەلەی نەژاد کێشەیەکی ئالۆزە، بەلاّم بەردەوام ڕۆژبەڕۆژ بایەخی خۆی بزر دەکا، هەندێ جار، وەك لە فرانسا دەبینین وا ڕێدەکەوێ بە تەواوی لە ناوبچێ. ئایە ئەمە ئەگەر بە وردی بۆی بڕوانین ڕووخانە ؟ (...) فرانسا کە نەتەوەیەکە بە تەواوی بووەتە میللەتێکی ڕەشۆکی، کە لە هەقیقەتدا ڕۆڵی میرزایی (جەنتلمان) لە جیهان دەگێڕێ. ئەگەر نەژادە نزمەکان لە لایەك دابنێین، ئەو دەمە تێکەڵبوون بە نەژادە گەورەکان واتە ژەهراوی کردنی جۆری مرۆڤایەتی، بەلاّم وای بۆ دەچم لە ئایندە مرۆڤایەتی بریتییە لە تێکەڵی، هەموو جۆگە نەژادییەکان ڕووبارێك پێکدەهێنن، لێرەوە بیرەوەری گشت هەرێمەکان بزر دەبن. )). جەنگی ساڵی ١٨٧٠-١٨٧١ دەبێتە شۆکێکی ئەخلاقی ترسناك بۆ ڕێنان. بۆیە هەڵوێست وەردەگرێ و گەشەسەندنی دیمۆکراسی کۆمەڵگای فرانسی ڕەت دەکاتەوە، (وەك ئەوەی ڤیشی کردی لە ١٩٤٠)، ئەمەش وای لێ دەکا ببێتە یەکێك لە سەرچاوە بێ وێنەکانی نەریتی کۆنەپارێزی بگرە کۆنەپەرستیش، یان یەکێ لە سەرچاوەکانی مۆراسیسیزم کە دژەسامییە(٦)، هەڵبەت لەگەڵ نۆگوست کۆنت. ڕێنان پێی وایە، لە ئەنجامی بیرکردنەوەکانی، سەدەی بیستەم سەدەیەکی ڕەشە بۆ مرۆڤایەتی : ( جەنگی قڕکردنی یەکتری سەرهەڵدەدا، جەنگێك هاوتای ئەو جۆرە گیانەوەرانەی دڕندەوگۆشت خۆرن لە پێناوی مانەوە یەکتری لە ناو دەبەن. ئەمەش دەبێتە کۆتایی ئەو تێکەڵییە بە پیتەی کە لە کۆمەڵێك توخم پێکهاتووە و پێویستە و ناوی لێ دەنێین: مرۆڤایەتی.)

کێشەی ئەلزاس و لۆرێن خێرایی بە گەشەسەندنێکی ڕۆشنبیری دەدەن، چونکە ئەلزاسییەکان لە نەژادی ژەرمەنین(ئەلمانی)، بەلاّم دەیانەوێ ببنە فرانسی. لێرەوە ڕێنان بیری ئەوە ڕەپێش دەکا نەتەوە جێگای نەژاد بگرێتەوە، ئەمەش وەك بەرهەمێکی مێژوویی و کردەیەکی خۆبەخش و کارێکی ئاسایی دەبینێ. پرۆسەی شارستانی بە شێوەیەکی بێ وێنە بنچینەی بیری نەژاد لە ناو دەبا، ڕێنان لەو باوەڕەدایە میللەتان بریتین لە دروستبوونێکی مێژوویی دوور لە هەموو

کارێکتەرێکی فیزیۆلـۆژی. کتێبـە بـچووکەکەی شـلۆمۆ سـاند لـە بـارەی ئـەم ڕێنانەیە، ئەو ڕێنانەی تا ئێستا گرینگی و بایەخی خۆی مـاوە. کۆنفرانـسـە بـە ناووبانگەکەی ۱۱ مارسی ۱۸۸۲ کە لە ژێر ناوی (نەتەوە چییە ؟) بوو (تێبینی وەرگێڕ : ئەم کۆنفرانسە بە ناووبانگـەی ڕێنـان لـە لایـەن د. موحـسین ئەحمـەد عومـەر وێرای لێکۆڵینەوە بۆ کوردی وەرگێڕدراوە، بڕوانە گۆڤاری کوردۆلۆجی ژ : ۲، ۲۰۰۸) نووسـەر بـاس لـە دوو ڕەت کردنـەوە دەکـا، تێکـەڵبوونی نـەژاد و نەتەوە، تێکەڵبوون لە نێوان گرووپی ئیتنۆگرافی و یان گرووپی زمانـەوانی لەگـەڵ ئەو گەلانـەی بـە هـەقیقی هـەن. بـە مێـژووی فۆرمـە گـەورەکانی کۆبوونـەوە سیاسییەکان دادێتەوە بۆ پیشاندان کە نەتەوەی مۆدێرن لە (ئەنجامێکی مێژوویی بە هۆی زنجیرەیەك کێشە دروست بووە کە بە یەك ئاراسـتە گەشـەیان کـردووە). هەرچەند نەژاد گەشە بکـا و پـێ بگـا، ئەوەنـدەش نەتـەوە زیـاتر کۆتـایی بـە دروستبوونی دێ. تا ڕادەیەك هەمان ئەو وشانەی سـی و پێـنج سـاڵ پێـشتر بـە کاردەهێنێ کە لە نامەکەی بـۆ گۆبینـۆ نووسـیوونی : ( کێـشەی نـەژاد کـە لـە سـەرەتادا بنچینەیی بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ گرینگی و بایەخی خۆی بزردەکا.)

ئەنجامی ئەم بیرکردنەوەیە ئەم پێناسە نایابەی نەتەویە کە ڕێنـان پێـشکەشمان دەکا : ( نەتەوە گیانە (ئەقڵە)، پرەنسیپێکی ڕوحییە، دوو شت هەن، لە ڕاستیدا یەك شتن، ئـەم گیانـە، ئـەم پرەنـسیپە پێکـدەهێنن، یـەکێکیان لـە ڕابـردووە، ئەویتریان لە ئێستادایە، یەکێکیان بریتییە لـە بـوونی میراتێکـی دەوڵەمەنـدی بیرەوەری، ئەویتریان ڕەزامەندی هەنووکەیی و ئارەزووی بە یەکەوە ژیان، ئیرادەی درێژەدان بە پیشاندان و دەستگرتنەوە بەو میراتەی کە بـە شـێوەیەکی هاوبـەش پێیان گەیشتوون و بۆیان ماوەتەوە.) هۆی بە ناووبانگی و بلاوبوونەوەی تێرمی نەژادی سـامی دەگەڕێتەوە بۆ ڕێنان، پێش ئەو تەنیا لەسەر ئاسـتی هەنـدێ زانـا باسی لێ دەکرا. لەو کاتەی (دژەسامی، یان دژە سامیزم) بلاو دەبووەوە و پەرەی دەسەند، ڕێنان بە ئەرکی خۆی زانی کۆنفرانسێك لـە ژێـر نـاوی (جـوداییزم وەك نەژاد و وەك ئایین) لە ۲۷ /۱/۱۸۸۳ پێشکەش بکات، کە وەك گەڕانەوەیەك بوو بۆ ڕاستکرنەوەی شتەکان. لـەم کۆنفرانـسە ڕێنـان جیـاوازی لـە نێـوان ئـایینی

گـەردوونی (یـان ئـایینی جیهـانی) وەك (هینـدۆییزم، کریـستیانیزم، بـودیزم و ئیسلامیزم) و ئایینی مەحـەلی (لۆکـالی) دەکـات کـە تایبەتـە بـە گروپێکـی دیاریکراوی خەڵك. مەسەلەکە ئەوەیە کە کێشە سەرەکییە مێژوویـیـەکان وایـان کردووە ئایینە گەردوونییەکان ئایینە بچووکەکان لە ناوبەرن. لەوەش بێگومـانین کە ئایینی جوداییزم لە سەرتادا ئایینێکی مەحەلی بووە، جیاوازی کەمی لەگەڵ ئایینی گەلانی هاوسێکانیان هەبووە، بەڵام لە سەدەی هەشتەمی پێش زایینەوە، پەیامبەرەکان خۆیان هەستییان بـەوە کـرد فـۆرمێکی دیکـەی ئـایین داهێـنن، ئەمەش ئایینی ئەو خودایە بوو کە داهێنەری جیهان بوو، کە حەز لە چاکە دەکا و خراپە سزا دەدا : ( کە بانگ بۆ ئـایینێکی لـەم جـۆرە دەدرێ، چـیتر لـە نـاو سنووری نەتەوەیەك نامێنینەوە، پڕ لە هۆشیاری مرۆڤایەتی دەبین، ئەمـەش بـە مانا هەرە فراوانەکەی. ) بەو مانایەیە کە پەیامبەرەکان بـانگ بـۆ (مەسـیحی نەزارێ ) دەدەن و کریستیانیزم سەرهەڵدەدا. لێرەوە مەسـیحییەتی جوولەکـەکان Messianisme juif خۆی بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەکاتەوە.

سەرەنجام لێرەوە جیهانیی پەیامی جوداییزم ناتوانێ وەك ئایینێکی تایبەت بە نەتەوەیەك لە خۆی بڕوانێ. لەبەر ئەوە، بانگهێشتن بۆ سەر ئایینی جـوداییزم لـە سەدەکانی دوایی پێش زایین، (سەدەی یەکەم و دووەم و سـێیەمی پـێش زایـین) زۆر بە هێز و چالاك بوو، هەر لە بەرایی سـەردەمی یۆنانی و ڕۆمانییـەکان چـیتر جوداییزم مانای ئایینی ئیتنـۆگرافی نەدەگەیانـد. (واتـە چـیتر ئایینێـك نـەبوو تایبەت بە نەتەوەیەك بێ). ئەگەرچـی جـوداییزم ئـایینێکی داخـراوە و زۆر بـە شاراوەیی لە ڕووی ناوەوە هەنگاوی ناوە، بەڵام بۆ چـەندان سـەدەی دوور و درێـژ کـراوە بـوو بـۆ هـەموو لایـەك. ئـەوەی کـە جوولەکـەکانی بـە یـەکگرتوویی هێشتۆتەوە، پەروەردەی هاوبەش و بەیەکەوە چەشتنی فـشارە کۆمەڵایەتییـەکان بووە. ئەمەش هیچ پەیوەندی بە ئیتنۆگرافی و نەژادەوە نیە. بۆ ڕێنان، جـوداییزم لە سەردەمی خۆی بەشێك بووە لە هێزە لیبراڵە گـەورەکان:( کارەکـانی سـەدەی نۆزدەم ئەوەیە هەموو (گێتۆ)یەکان لە ناوبەرێ. ستاییشی ئەوانـەش ناکـەم کـە دەیانەوێ بیژێننەوە. نەژادی ئیسرائیلی مەزنترین خزمەتی پێشکەش بـە جیهـان

کردووه. ئەوان لە ناو نەتەوە جیاجیاکان تواونەتـەوه، بـە شـێوەیەکی هـارمۆنی لەگەڵ یەکێتییە نەتەوەییە جیاجیاکان ژیاون، لە ئاییندەش درێژە بەوە دەدەن کـە لە ڕابردوو کردوویانە. بە هاوکاری کردن لەگەڵ هەموو هێزە لیبرالەکانی ئۆرووپـا، بەشداری لە پێشکەوتنی کۆمەلایەتی مرۆڤایەتی دەکەن.)

ئەگەر هەندێ لەو ئەنجامانەی پێیگەیشتووە و هەندێ لە بۆچوونە دلنیاکـانی کە وشکن، بۆ خوێنەری ئەمڕۆ قووت نەدرێ و سکاندال بێ، دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کە لە کارەکانی گیانی سەردەم هەیە و دەولەمەندن بە بە بـیر و بۆچـوون. بەم شێوەیە، کە ڕێنان دەبینێ گەلی فرانسا لە سەردەمی کۆماری سێیەم بووەتـە دژە دەستەلاتی پیاوە ئایینییەکان و دەتوانێ خۆی لە دەسـتەلاتی کلێسا بپارێزێ، پێی وایە، بۆ یەکەمین جار، نزیکبوونەوەیەکی زۆر هەیە لـە نێـوان هەلـبـژاردەی هەوادارنی ئازادی بیرکردنەوە و کۆمـەلانی خەلکی بە شارسـتانی بـوو بـە هـۆی فێرکردن و پەروەردە. لێرەوە ڕێنان دەبێتە کۆماریخوازێك لە کاتێکدا پاش سالانی ١٨٧٠، ١٨٧١ زیاتر وەك کۆنەپەرستێك دەهاتە بەرچاو، شانۆی فەلسەفی ڕێنان لە سەروبەندی سالانی ١٨٨٠ پێکدێ و دەیەوێ نوێنەرایەتی ئەم هەقیقەتە نوێیە بکـا. لـە ڕێگـای خوێندنـەوەی شـانۆگەری (ڕەشـەبا)ی شکـسپیر، دەیـەوێ بەیەکگەیـشتنی کالیبـان (کـە نوێنەرایـەتی گـەل دەکـا) و پرۆسـپێرۆ (کـە نوێنەرایەتی ئازادی بیرکردنەوە دەکا) بگێڕێتـەوە(٧) : ( نـەژادە نزمـەکان، وەك قوولەڕەشـە رزگاربووەکـان، پـێش هـەموو شـتێك سوپاسـگوزارییەکی ناشـرین بەرامبەر بە ئەوانەی بە شارستانیان کـردوون پیـشان دەدەن. کـە لـە هەژانـدنی حاکمەکانی خۆیان سەردەکەون، بە زۆردار و چەوسـێنەر و فێلبازیـان لـە قەلـەم دەدەن. کۆنەپارێزەکانیش خەون بە هەوڵ و تەقەلایەکەوە دەبینن ئـەو دەسـتەلاتە بگێڕنەوە کە لـە دەسـتیان چـووە. پیـاوە ڕۆشـنبیرەکان ڕژێمـی نـوێ بـێ هـیچ بیرکردنەوەیەك وەردەگرن تەنیا ئەوەندە نەبێ مافی هەنـدێ گالتـە و شـۆخی بـێ ئەنجامیان هەبێ. ) کالیبان تەنیا گـەلی پرۆلیتـاری ئـۆروپی نیـە بـەلکو بـە شێوەیەکی شاراوە گەلی کۆلۆنیزەکراویـشە، پرۆسـپیرۆش کۆلۆنیکـەرە. نووسـەر ئێمێ سیزێر جوان لە کارەکانی ئەمەی پیشانداوە.

ئەو کەسەی کە بۆ ئێدوارد سەعید نوێنەرایەتی بێ ڕکابەری ڕۆژهەلأتناسی دەکرد ڕێنان بوو، بەلأم ڕێنان دەمێك بوو لە لایەن هاوتاکانی خۆی لە کاتی مردنی لە ۱۸۹۲، وەك پیاوێکی ڕابردوو سەیریان دەکرد( بێجگە لە کارە فیلۆلۆژییەکانی) و کارە مێژووییەکانی هەمووی گوایە بە ڕای ئەوان سەردەمیان نەماوە. بەلأم گەشەسەندنی بیری سیاسی ڕێنان تێماندەگەیەنێ کە نزیکبوونەوەی لیبرالیزمی فەلسەفی لە کۆمار، تۆخمێکی جەوهەرییە لە پێکهاتەی کۆماری سێیەم.

١- www.infobretagne.com/renan-ernest.htm

٢- لە "نەتەوە و جوداییزم لە لای ڕێنان" کە ئەم پارچەیەی لێ وەرگیراوە، شلۆمۆ ساند دوو کۆنفرانسی گەورەی ئێرنست ڕێنان بلأودەکاتەوە : (نەتەوە چیە ؟) و ( جوداییزم وەك نەژاد و وەك ئایین)، کە پێشەکییەکی دەولەمەندی بۆ نووسیوە. ئەم دوو کۆنفرانسە بە دوای کارەکانی ساندەوە دێن لە بارەی سروشتی نەتەوە و چەمکی گەلی جوولەکە، بە تایبەتی لەو کارەی کە بە ناوی (چۆن گەلی جوولەکە داهێنرا) زیاتر دەردەکەوێ. ئەم کتێبە لە لایەن دەزگای فایارد، لە پاریس، لە ۲۰۰۸ چاپکراوە.

٣- ئێرنست ڕیچنان، پەیوەندییە گشتییەکان، وەشانی ئۆنۆرێ شامپیۆن. پاریس، بەرگی ۲، لا ٤٣٧.

٤- ئەم پەرەگرافانە لە کتێبی : "ئاییندەی زانست" دەرهاتوون، کە لە سالی ١٨٤٨و ١٨٤٩ نووسراوە، بەلأم لە سالی ١٨٩٠ چاپکراوە.

٥- ئێرنست ڕێنان، پەیوەندییەکان، بەرگی ۱، وەشانی کالمان لیڤی، پاریس، ١٩٢٦، لا ١١٩ و ئەوانی تر.

٦- شارل مۆراس : ئیدیۆلۆگێکی فرانسییە ئەوپەڕی ڕاست ڕەوە، دژە سامییە. (١٨٦٨-١٩٥٢)

٧- کالیبان لە تەواوی کارەکان. وەشانی کالمان لیڤی، پاریس، ١٩٤٩، لا ٤١٢.

* هێنری لۆرەنس : پرۆفیسۆرە لە کۆلێژ دو فرانس، نووسەری کتێبی (کێشەی فەلەستین)ە کە لە لایەن دەزگای فایار چاپکراوە، ئەم کتێبە سێ بەرگە، هەر بەرگەی لەم سێ سالە چاپکراون : ١٩٩٩، ٢٠٠٣، ٢٠٠٧.

## ناساندنی چەند کتێبێك

**داستانی مەمێ ئالان . ئامادەکردن و وەرگێڕان و پێشەکی : ڕۆژی لیسکۆ .**
**پێشەکی : کەندال نەزان . زنجیرەی کتێبی گزنگی گەلان . گالیمار .١٩٩٩**

- MaméAlan, Épopée kurd.
texte établi , traduit du kurde et présenté par Roger Lescot.
Préface de Kendal Nezan . nrf , L´auble des peuples . Gallimar. ١٩٩٩.

ئەم کتێبە بریتییە لە تێکستی فۆلکلۆری داستانی یان بەیتی مەمێ ئالان ، کە لە لایەن کوردناس ڕۆژی لیسکۆ ئامادەکراوە و پێشەکی بۆ نووسراوە، دوای خۆی وەك دەستنووس لە لایەن خێزانەکەی پارێزراوە، پاشان بۆ جاری یەکەم ساڵی ١٩٩٩ لە لایەن دەزگای ناسراوی فەرەنسی گالیمار چاپکراوە .
کتێبەکە بریتییە لە تێکستێکی ئامادەکراو لە بەر ڕۆشنایی چەندان تێکستی دیکەی فۆلکلۆری کە لیسکۆ لە چلەکانی سەدەی رابردوو لە سوریا ئامادەی

کردووە و وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی . نووسەر پێشەکییەکی دوور و درێژی لە بارەی چۆنیەتی بە دەست هێنان و کۆکردنەوەی دەستنووسەکان و ئینجا ساغ کردنەوە و بەرامبەر یەکتری دانانی دێر بە دێری بەیتەکە و پاشان وەرگێڕانیان بۆ فەرەنسی نووسیووە ، وێڕایی پیشاندانی هەندێ جیاوازی بەر چاو لە نێوان تێکستەکان بە پێی خشتەیەکی دیاریکراو. لە هەمان پێشەکی لیسکۆ باس لە داستان و فۆلکلۆر دەکا لە ناو ئەدەبیاتی کوردی نووسراو و نەنووسراو کە مێژوویەکی ئالۆز و کۆتی هەیە. بۆ ئەم چاپە فەرەنسییە کە لە لایەن (کەندال نەزان)ەوە سەرپەرشتی کراوە، پێشەکییەکی دوور و درێژ نووسراوە لەگەڵ نەخشەیەکی کوردستان، پێشەکییەکەی کەندال نەزان زیاتر هەڵکەوتێکی مێژوویی هەیە ئینجا ئەدەبی و فەرهەنگی. دەتوانین بە یەکێ لەو کتێبە جوانانەی دابنێین کە لە فەرەنسا ساڵی ١٩٩٩، پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا.

Memé Alan , avesta . ١٩٩٧, Istanbul .

مەمی ئالان ، بلاۆکراوەی دەزگای ئاڤێستا ، ئیستەنبول ، ١٩٩٧

ئەم کتێبە هەمان ئەو کتێبەی ڕۆژێ لیسکۆیە بەڵام تێکستە کوردییەکەیەتی ، واتە ئەو تێکستە ئامادەکراوەی کوردی کە پێشتر بۆ وەرگێڕانی فەرەنسی لە لایەن لیسکۆ ئامادەکرا بوو. وەرگێڕ (مەزهەر گونبەت) پێشەکی کتێبەکەی لیسکۆی وەکو خۆی وەرگێڕاوەتە سەر کرمانجی، سەرەنجام لەگەڵ تێکستەکە بە یەکەوە لە لایەن دەزگای ئاڤێستا چاپکراوە.

- سەلاحەدین و کورد، نووسینی بۆریس جەیمس

- Boris JAMES . Saladin et les kurdes .
Perception dún groupe an temps des croisades .
Ètude kurde . revue semestríelle de reherches .
n°hors série ll , mars ٢٠٠٦ . Institut kurde de paris ,
L´harmattan . ٢٠٠٦ .

بۆریس جیمس، سەلاحەدین و کورد. تێبینی و هێزی گروپێك لە سەردەمی خاچ پەرستەکان. ژمارەی تایبەتی گۆڤاریEtude kurdes - لێکۆڵینەوەی کوردی، کە لە لایەن ئەنستیتوی کوردی پاریس و دەزگای نارماتان چاپکراوە. ژمارە ١١- ٢٠٠٦ . ٢٢٨ لاپەڕە.

ئەم کتێبە کە لە بنچینەدا تێزی دکتۆرای (بۆریس جیمس)ە کە وەك کوردۆلۆگێکی لاو بەم کتێبە، زۆر بەهێز و بە توانـاوە هاتۆتە ناوەندی کوردۆلۆژی. ساڵی پار نووسەر راستەوخۆ لە هەولێر بەشداری لێکۆڵینەوە کوردۆلۆژییەکان بوو کە لە لایەن زانکۆی سەلاحەدین و ئەنستیتوی کورد لە هەولێر بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەسترا.

نووسەر لە فەسڵی یەکەم باس لە سەلاحەدین و کورد دەکا، سەرهەڵدان و گەشەسەندن و بەهێزبوونی بنەماڵەی ئەیووبی لە کوردستان و رۆژهەلاتی ناوەراست. باس لە رۆڵی خێڵ دەکا لە سەدەکانی ناوەراست. نەخشەی شارستانی و پێکهاتووی کورد لە رووی دانیشتوانی خێڵ و هۆزەکان، کۆچ کردن، ئەیووبییەکان وەك ناوکێکی بە دەسەلاتی کوردی لە نێوان خێڵ و هۆزە کوردەکان لە سەدەکانی ناوەراست. خێڵەکانی بەشنەوی، شارەزووری ، حومەیدیە ، زەرزارییە ، هەکاریە و هەزبانیەکان .

بەشی دووەم تایبەتە بە وێنە و ناسنامەی کورد لە سەدەکانی ناوەراست، پێناسە و چەمکی ئیتنۆگرافی و سەرهەڵدانی نوێنەرایەتی کۆمەلایەتی و سیاسی . شوێنی کورد وەك کارێکتەر و ستراتیژی ئیتنیکی . پێوەرەکانی کوردایەتی، چۆن کورد لەو سەردەمە ناسرێتەوە، ئینجا رۆڵی کورد لە چوارچێوەی دەسەلاتی سەلاحەدین، دەزگا سوپاییەکانی کورد لەو سەردەمە، ناکۆکییەکان و پێکهاتووی سوپای کوردی سەلاحەدین. بەرپرسیاری هێزە کوردییەکان کە وەك بنچینە بوونە لەو دەسەلاتەی سەلاحەدین. پەیوەندی کورد و مەملوکەکان، کورد و تورکەکان وەك فاکتەرێکی تازە، کاریگەری کورد لە ناو سوپای سەلاحەدین، ئەو

چەوساندنەوانەی بەرامبەر کورد کراون. میرە کوردەکان و ڕۆڵ و پێناسەیان لەو سەردەمە. کەسایەتییە کوردییە سەرەکییەکان لە ناو سوپای دەوڵەتی ئەیووبی. ئینجا نوخبەی قەزایی و سیاسی و مەدەنی. لە کۆتایی بابەتەکەی دوای ئەنجام و بیبلۆگرافیا، نووسەر بیبلۆگرافیایەکی تێر و تەسەلی لە بارەی تەواوی ئەو سەرچاوانە ئامادەکردووە کە پەیوەندییان بە کورد و ئەیووبی و دەوڵەتی ئەیووبی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و سەلاحەددینەوە هەیە، وێڕایی سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان لەم بارەیەوە . وێڕایی نەخشە و خشتەی دەسەلاتی بنەماڵەی ئەییووبییەکان.